# بەیان

گۆڤارێکی ئەدەبیە، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، مانگی جارێك بلاوی دەکاتەوە

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية
ساحة الخلاني ـ بغداد
تەلەفون: ٥/٨٨٧٥٧٩٥ خەت



سەرنووسەر
اسماعيل رسول احمد

بەڕێوەبەری نووسین
صلاح مصطفی جەلالی


## لەم ژمارەیەدا

# هونەرەکانی ئەدەب

کاکەی فەللاح

**ئەدەب ، وەك ئەوروپاییەکان تەعریفیان کردوە ، بەو بەرهەمە دەڵێن کە بە هۆی تایبەتیەکانی دارشتنیەوە ، هەستی جوانکاریو هەڵچوونو روژاندنی سۆزمان تیا بجوولێنێ .. مەبەستمان لە تایبەتیەکانی دارشتن ، شێوەی هونەری داستان یان چیرۆك یان وتار یان قەسیدەیە ، لەگەڵ ڕێگای دەربڕینی زماندا .**

قسەو گفتوگۆی ئاسایی بە ئەدەب دانانرێت ، چونکە تایبەتیەکانی شێوەی زمانی ئەدەبی نەگرتۆتە خۆی . مەبەستیشمان لە هەستی جوانکاری ئەوەیە کە ئەدەب هونەرێکی شیرینو جوانە .. کە بایەخی جوانکاری نەبوو ئەوا ئەدەبیش نییە . بۆ هەڵچوونی سۆزیش ئەبێ ئەدەب گەرمیی سۆزی تیابێت ، ئەگەر وانەبوو ، ئەوا وەك راستەقینەی زانستیانەو بیرکاری لێدێتو لە ئەدەب دەکەوێت . تەنانەت ئەگەر بەرهەمی ئەدەبیش لەسەر بیر دابمەزرێت ئەوا هەر پێویستی بەو گەرمو گوڕییە هەیە کە بتوانێ ویژدانی مرۆڤ بجوولێنێت .

بە شێوەیەکی گشتی ئەدەب دەکرێ بە دوو بەشەوە : شیعرو پەخشان. شیعریش وەك شیعری گۆرانیو شیعری داستان لە وێنەی داستانی یەکەمی قارەمانێتی وەك ئەلیاذەو ئۆدیسای هۆمیرۆسو ئەنیادەی شاعیری رۆمان فەرجیلو شانامەی فیردەوسی فارسو مەهباراتاو رامایانای هیندۆکە کۆنەکان . هەروەها شیعری درامیش کە یونانیە کۆنەکانو رۆمانەکان شانۆگەرییان پێنوسیوەتەوە ، دوا بەدوای ئەوانیش ئەدیبە کلاسیکیە رۆژئاواییەکان بابەتی تراژیدیو کۆمیدییان پێداناوە . چەشنی چوارەمی شیعر بابەتی شیعری فێرکردنە . ئەم چەشنە شیعرە لە ئەوروپا ، بەتایبەتی لە لای یۆنانو رۆمانە کۆنەکان ، هەر بە شیعری مایەوەو بە هۆنراوە ـ نظم ـ نەگۆڕا .

زۆر قەسیدەی درێژ درێژ لە لای یۆنانیەکان دەبینین کە شێوەی فێرکردنیان تیایەو لەگەڵ ئەوەشدا تایبەتییەکانی شیعریان هەیە وەك وێنەو خەیاڵو بایەخی جوانکاری کە هەوێنی شیعرن . نموونەی ئەوەش قەسیدە درێژەکەی ( هیزیودوس )ی شاعیری یۆنانەکە بە ناوی ( کارەکانو رۆژەکان )ەوەیە کە باسی وەرزی کاروباری ژیانی لادێو چەشنەکانی کشتوکاڵو ئەو بەروبوومانە دەکات کە لە وەرزی خۆیانا دەچێنرێن ،

باسێکی ئەوتۆ کە بە گیانی شیعرو شێوازو بایەخی جوانکاری ئاودراوە . هەروەها قەسیدەیەکی نایابی‌تر کە هی ( لوکریشیوس )ی شاعیری رۆمانە بە ناونیشانی ( سروشتی شتەکان )ە ، دەربارەی ژیان‌و سەرچاوەکەی دەدوێت‌و چۆن رووی کردۆتە ڕووەك‌و ئاژەڵ‌و مرۆڤ‌و تایبەتی‌یەکانی هەر یەکێك لە مانە بە شێوەیەك قووڵی‌ی فەلسەفەو گیانی شیعری باڵدارو خەیاڵاوی گرتۆتە خۆی ..

وتمان ئەدەب ، کۆن‌و نوێ ، دەکرێ بە دوو بەشی گەورەوە.. ئەم دابەش‌کردنە لە هەموو زمانەکانی جیهاندا هەیە ، شیعرو پەخشان .

ئاخو بنچینەی ئەم دابەش کردنە چی‌یەو ؟ هەوێنی سەرەکی‌و پێناسەی هەر یەکێك لەم دووبەشە کامەیەو ؟ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مێژووی دەرکەوتنی ، هەریەکێك لەم دوو هونەرە بەگشتی لە کەیەوە دەست‌پێ‌دەکات ؟

ئاشکرایە مرۆڤی سەرەتایی کە فێری زمان بوو لە ڕێگای پەخشانەوە پێویستیەکانی ژیان‌و هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ غەیری خۆیدا دەردەبڕی .. ئەگەرچی جیاوازیەکی گەورە لە نێوان زمانی گفتوگۆکردنی پەخشان‌و پەخشانی ئەدەبیدا هەیە . بەڵام شیعر ، هەر کە مرۆڤ پەی‌پێ‌برد بوو بە هونەرێکی جوان‌و لە کاروباری مەبەستە ئاساییەکانی ژیاندا بە کاری نەدەهێنا ، بەڵکو بە شێوەیەکی تایبەتی دەهۆنرایەوەو بۆ چەند ئامانجێکی تایبەتی تەرخان دەکرا . ئەم ئەرکە کردی بە سامانێکی ئەدەبی بەجێ‌ماو .. هیچ کەس ناتوانێ بڕیار لەسەر ئەو گیروگرفتە بدات

کە ئایا شیعر پێشتر لە دایك بوو یان پەخشانی ئەدەبی لە مێژووی مرۆڤدا .. لەوانەیە مرۆڤی سەرەتایی پەخشانی وەك هۆیەکی هونەری بەکارهێنابێت بۆ کارکردنە سەر ئەم‌و ئەو ، پێش ئەوەی شیعری بەکارهێنابێ . دوور نی‌یە خوتبەش پێش شیعر نەکەوتبێ . بەڵام ئەم چەشنە بیرکردنەوە تیوری‌یە لەوانەیە لە ژێر سایەی راستەقینەی‌مێژوودا هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبەخشێت.. کۆنترین دەقی ئەدەبی کە پێمان گەیشتوە دەقی شیعرە نەك پەخشان . لەوانەشە هەموو هونەرەکانی ئەدەب پێش داهێنانی نووسینی‌و نووسینەوە کەوتبن ، ئەو دەمە ئەدەب لە بەردەکرا ، ئاشکرایە کە شیعر لە پەخشان ئاسانتر لەبەر دەکرا ، بۆیە دەقە کۆنە شیعرەکان بیرنەچوونەوە ، بەڵام دەقە پەخشانەکانی وەك خوتبەو وتار بیرچوونەوە . مرۆڤ دەماو دەم شیعرە لەبەر کراوەکانی گێڕایەوە تا نووسین داهات‌و چەرخی نووسینەوە دەستی‌پێ‌کرد ، سەرەتاش هەر شیعرە لەبەرکراوەکانی نووسیەوە لەبەرئەوە لە کتێبەکانی ئەدەب‌و مێژوودا هەمیشە ئەوە دەخوێنینەوە کە گوایە شیعر پێش پەخشانی ئەدەبی دەرکەوتوە سەبارەت بەوەی ، وەکوو وتمان، کە شیعر ئاسانتر لەبەردەکراو دەماودەم هات هەتا سەردەمی چەرخی نووسینەوە . ئەم بۆچوونە تەنانەت هونەرە جیاوازەکانی شیعریشی گرتەوە . دەبینین کتێبەکانی ئەدەب‌و مێژوو دەڵێن کەوا شیعری داستان ، واتە شیعری مێژووی قارەمانێتی ئەفساناوی پێش شیعری گۆرانی کەوتووە ، ئەم بۆچوونە ژێری نایسەلمێنێ چونکە مرۆڤی سەرەتایی پێش هەموو شتێك گۆرانی بۆ دەروونی خۆی‌و

بابەتەکانی خۆشی‌و ناخۆشی‌و تێکۆشانی لە پێناوی ژیاندا وتوە، لەوانەیە ئەم گۆرانیانەی هەر بۆخۆی وتبێ ، یان بۆ مرۆڤەکانی سەربەخۆی ، ئەم چەشنە شیعری گۆرانیە خۆیەش کەسی هان‌نەداوە لەبەری بکەن یان بیگێڕنەوەو دەماودەمی پێ‌بکەن ، بە پێچەوانەی شیعری داستانەوە کە بەسروشت شیعرێکی سەر بە کۆمەڵەو رەوشت‌و نەریت‌و بیرو باوەڕو ئەفسانەو خواوەندەکانی گەلانی ئەو سەردەمە کۆنانە وێنە دەگرن‌و وەك تۆمارکەرێکی ژیانی سەرەتایان پاڵی بەم‌و بەوەوە ناوە کە لەبەری‌بکەن‌و بیگێڕنەوەو ببێتە ئاوێنەیەکی رابوردووی ئەو گەلانەی کە بیریان لە رابوردوویان کردۆتەوەو پەرۆشی بوون‌و شانازی‌یان پێوەکردووە بۆبەرەو ڕووبوونەوەی گەلانی‌تر .. هۆی ئەمەیە کەوا شیعری داستان پێش هەموو هونەرەکانی تری شیعر پێمان گەیشتوە ، ئەگەرچی ناتوانین لەسەر ئەوە سوور بین کە شیعری داستان پێش هونەرەکانی تری شیعر دەرکەوتوە ، بەڵکو پێ لەسەرئەوە دادەگرین کەوا شیعری گۆرانی خۆیی پێشی‌کەوتوەو لە لۆچەکانی رابوردواون بووە ، ئەوەش کە پێمان‌گەیشتوە ئەو شیعرەیە کە کەوتۆتە دوای چەرخی داستان‌و پاش دەست‌پێ‌کردنی چەرخی نووسین‌و نووسینەوە .

سەرەتای چەرخی نووسینەوەو داهێنانی هونەری نووسین کاری‌کردەسەر دەرکەوتنی هونەرە جیاوازەکانی ئەدەب لە مێژوودا ، وەك چۆن ئاسانی یان گرانی لەبەرکردنی ئەم بەرهەمەش کارێکی‌تری بەخشی.

بەم پێیە با چاوێك بە مێژووی دەرکەوتنی ئەم هونەرانەدا بگێڕین بەپێی مێژووی ئەو دەقانەدا کە لە ئەدەبیاتی کۆن پێمان گەیشتوون . بە گوێرەی ئەوە شیعری داستان پێش شیعری گۆرانی کەوتووەو شیعری گۆرانیش پێش شیعری درامی کەوتوە .

چونکە کۆنترین دەقێك کە پێمان گەیشتوە بەرهەمەکانی شیعری داستانی هۆمیرۆسە ، دوابەدوای ئەو قەسیدەی شیعری گۆرانی‌یە ، ئنجا لە کۆتایی‌دا شانۆگەری‌یە شیعری‌یەکانە ، واتە شیعری درامی بە هەردوو چەشنی ترازیدی‌و کۆمیدی‌یەوە ، داستانی کۆن چیرۆکی قارەمانێتی‌یەکی ئەفساناوی ئەوتۆ بوو کە بە ئەفسانەی ئایینی ئاودرابوو ، گۆرانی بۆ شتی سەیرو سەمەرە دەوت ، بەو جۆرەی کە لە هەردوو داستانەکەی (ئەلیاذەو ئۆدیسا)ی هۆمیرۆسدا دەیان بینینی . داستان هەمووی بە شیعر دەنووسرایەوە ، ژمارەی بەیتەکانی لە (١٦) هەزار تێپەڕی‌دەکرد ، بەسەر (٢٤) گۆرانیدا دابەش‌دەکرا . ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە هەندێك لە هونەرەکانی ئەدەب لە سەردەمی درووستبوونیانا وا دیارە یەکگرتوو بوون ، بەرەبەرە ، لەگەڵ پێشکەوتنی سەردەمو لقوپەل‌هاویشتنی پێویستی‌یە دەروونی‌و جوانکاری‌و دەربڕینەکانی مرۆڤدا ، ئەویش بوو بە چەند لقێکی جیاوازەوە ، ئەگەرچی هەر لە ژێر سێبەرو سنووری یەك هونەری ئەدەبیدا مانەوە ، واتە لە یەك ڕەگەزی ئەدەبی دیاری کراو . باشترین نموونەی ئەم گۆڕینە ئەدەبیەش لە هونەری شانۆگەریدا دەبینین ، ئەم هونەرە لە لای یونانە کۆنەکان شیعرو مۆسیقاو گۆرانی‌و سەمای گرتبوە خۆی ، شانۆگەری‌ی یۆنانی کۆن لە چەن بەشێکی نواندنی گفتوگۆ پێك‌هاتبوو لەگەڵ چەن بەشێکی گورانی کە کۆرس دەی‌وت‌و بە ئورکستراوە کە بزوتنەوەی چەن سەمایەکی ئاوازاوی بوو ، شان بەشانی چەند ئاوازێکی مۆسیقای سادە کە دەقە شیعری‌یەکە دانەپۆشێت بەو چەشنە هەموو هونەرەکان لە یەك شانۆگەریدا کۆدەبوونەوە . کە ڕاپەڕینی ئەوروپا دەستی پێ‌کردو ( قسطنطینیە ) لە ساڵی ١٤٥٣دا کەوتە دەست تورکەکان، قەشەکان لە کڵێساکانی هەڵهاتن بە دەستنووسەکانی سامانی کۆنی یۆنان‌و ڕۆمانەوە ڕوویان کردە ئیتالیاو ئنجا ئەوروپاو بڵاوکردنەوەی ئەو دەستنووسانەش بوون بە هۆی زیندوو کردنەوەی ئەو سامانە کۆنانەو کران بە بنچینەی ڕاپەڕینی نوێ‌و گەڕانەوە بۆ ئەو جۆرە شانۆیەی کە یۆنانیە کۆنەکان دەیان‌ناسی ... بەڵام لە شاری فلۆرەنسای ئیتالیا ، لە چەرخی پانزەیەمی زایینی‌دا ، ئەم هونەرە گۆڕینێکی کاریگەری بەسەرهات‌و بوون بە دوو لقی جیاوازەوە ، واتە : هونەری شانۆی گۆرانی‌و هونەری نواندنی رووت ... هونەرمەندەکانی فلۆرەنسە هونەرێکی شانۆی تایبەتی بابەتی ئاوازیان داهێنا کە بە هونەری ( ئۆپێرا )و لە پاشا (ئۆپەرێت ) ناسراو لە هونەری نواندنی شانۆیی جیاکرایەوەو ڕەنگی تایبەتی خۆی وەرگرت .. هەر لە فلۆرەنسەشەوە هونەری شانۆی گۆرانی هەموو ئەورووپای گرتەوە.

وەك چۆن ئاوازو گۆرانی ، لە چەرخی پانزەیەمی زایینیەوە لە هونەری شانۆی تایبەتیدا ، سەربەخۆ بوو ، هەروەهاش هونەری سەمای دەربڕین لە هونەرێکی تایبەتی خۆیداو چەسپاندنی چەند بنچینەیەکی هونەری تایبەتی ، لە چەرخی نۆزدەیەمەوەو بە تایبەتی لە روسیادا ، جیابوەوەو ئەمڕۆ بەناوی هونەری ( بالێ )وە ناسراوە .. ئەو هونەری یەکگرتووی شانۆیەی کە یۆنانە کۆنەکان نواندن‌و ئاوازو گۆرانی‌و سەمایان تیا کۆ دەکردەوە پێش‌کەوت‌و گۆڕراو جیابووەوە ، ئەوەتا هونەری نواندن سەر بەخۆیەو ، گۆرانی‌و مۆسیقاش شانۆی تایبەتی خۆی هەیە بە ناوی ( ئۆپێرا )وەو سەمای دەربڕینیش هونەرێکە بە ناوی ( بالێ )وە .

* * *

# هەنگاوێک بۆ ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی



حاجی قادری کۆیی

● محەمەد عەلی قەرەداغی ●

لە ئەنجامی گەڕانو بەراوردکردنی چەند کەشکۆڵێکدا یەک دوو پارچە شیعری کوردیو فارسی حاجی قادری کۆییم دەستکەوتبوو لە سێ بەشدا ئامادەم کردن بۆ چاپ . هێشتا بەشی سێهەمم تەواو نەکردبوو کە مامۆستا ( جەمال بابان ) دوو سێ دەفتەری دەسخەتی ( مستەفا صائیب )ی دامێو ، وتی : بەڵکو شتی باشیان تێدا بێو سوودیان لێ وەربگری .

بەڵێ مامۆستا ( جەمال بابان ) لە ڕاستیدا دیارییەکی گەلێ گەورەو بەنرخی دامێو دەسخەتەکانیش زۆر بەسوودن . شیعری کۆمەڵێک لە شاعیرانی کورد وەک : حاجی ، نالی ، کەیفی ، ئەدەب ، وەفایی ، حەمدی ، فەتحی ، خەستە ، زێوەر .. تاد تێدایە . من کە خەریکی وتارنووسینو بلاوکردنەوەی شیعری ( حاجی ) بووم وتم : با جارێ لە ( حاجی ) یەوە دەست پێبکەم . دەبینم کۆمەڵێکی باشی شیعری حاجی تێدایەو نووسەرەکەی وردەکارو بە ئەمانەتەو ، دەسخەتەکان ـ هەرچەن لە کەمو کووڕی بەدەر نین ـ شتی زۆر چاکو نایابیان تێدایەو ، زیاد لەوەی هەندێ شیعری چاپنەکراوی حاجییان تێدایە ، ئەوانەیشی کە لە چاپەکاندا هەن لێرەدا ڕاسترو پوختەترن .

بۆیە هاتم قەسیدە بە قەسیدە دەستم کرد بە بەراوردکردنیان لەگەڵ چاپەکاندا . لە ئەنجامدا گەلێ جیاوازی ئاشکرام دۆزییەوەو ، رام هاتە سەر ئەوە ئەو شیعرانە لەم دەسخەتەدان لە چەند وتارێکدا ئامادەیان بکەم بۆ بلاوکردنەوە .

مەبەستیشم لەم کارە ئەوەیە کەرەسەی ڕاستو دروست بۆ لێکۆڵینەوەی دیوانی حاجی بخەمە بەردەستی پسپۆڕو شارەزایانی کورد . چونکە دیوانە چاپەکانی بەردەستمان زۆر ئاڵۆزنو . شیعرەکان سەرو گوێلاک شکاونو مەبەستیان تێدا ونبووە . بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستە دوو خاڵ دەسنیشان دەکەم :

١ ـ دوا چاپی دیوانی حاجی کە خوا لێخۆشبوو مامۆستا گیوی موکریانی پێشکەشی کردووە کە هەق وایە لە هەموو چاپەکان باشتر بێ ، زیاد لە ئاڵۆزی ، ( مۆرکی تایبەتی ) مامۆستا گیوی پێوەیە ، ئەو مۆرکەیش بریتییە لە گوێ بە ئەمانەتی عیلمی نەدانو ، دەستکاری کردنی شیعرو وشە بە گوێرەی ئارەزووی شەخسی . لێرەدا ڕەنگە خوێنەرێک بڵێت : ئەم حوکمە زۆر سەختەو ڕەنگە ناڕەوایش بێ ! منیش دەڵێم : ڕاستیەک کە ناشاردرێتەوە ئەم حوکمەی من ئەسەلمێنێ . با درێژە بە هێنانو بردنی قسە نەدەینو بچینە لای چاپی سێهەمی دیوانی حاجی تا لەسەر زمانی گیو خۆی بەڵگەی بێ پێچو پەنات بدەمە دەست : گیو لە سەرەتای دیوانەکەدا

ــ لا ... لاپەڕە یەك ــ وێنەی لاپەڕەیەکی دەسـ... ...ـرەکانی حاجی بە ( زەنك ) چـــاپ کردووەو لە پاڵیا نووسیویە کە ئەو لاپەڕەیـــە باشێکە لە کەشکۆڵی ژمارە پێنج کە دەســـــخەتی ( حاجی ) یە . ئەم لاپەڕە وێنەگیراوە دوو پارچە شیعری حاجی تێدایە. ئێمە پارچەی دووەم دەکەین بە نموونە دەستکاری گیو بۆ شیعری حاجی‌و لەگەڵ چاپەکەدا بەراوردی دەکـــەین . بۆ ئـــەم مەبەستە با پێکەوە لاپەڕە هەڵدەینەوە تا دەگەینـــە لاپەڕە ( ٤١ ) تا بزانین گیو ئەم پارچەیەی چـــۆن نووسیوەتەوە .

**لێرەدا تەنیا وشەگۆڕاوەکان دیاری دەکەم .**

**شیعری یەکەم : (خ) ــ واتە دەســـــخەتەکە ــ ((ماهی)) (چ) ــ واتە چاپەکە ــ (( ماسی )) ، ( خ ) . (( جان )) ( چ ) (( گیان )) .**

**شیعری دووەم : ( خ ) : (( گواهن = گەواهن ))،**

**شیعری سێیەم : ( خ ) : (( نخل = نەخلی )) ، ( چ ) : (( سەروی )) .**

**شیعری چوارەم : ( خ ) : (( لبحر و بیشە = لە بەحرو بێشە ) ، ( چ ) : (( لە دەریاو مێشـە )) . ( خ ) : (( ضیغم )) ، ( چ ) : (( شێر )) .**

**شیعری پێنجەم : ( خ ) : (( طفیلیش )) (چ) : ( طفیلی ) ، ( خ ) : (( مهمانیە = میهمانییە )) : ( چ ) : (( میوانی‌یە )) ..**

٢ ــ بۆ خاڵی دووەم لە بەر ئەوەی دەسخەتەکانی مامۆستا گیومان لە بەردەستدا نیە ، دەبێ پەنا بەر دەسخەتی‌کە بەرین‌و ، خاڵەکە روون کەینەوە، ئەم خاڵەیش هەر لە ژێر چەترو سێبەری خاڵی پێشوودا جێگەی دەبووەوە بەڵام لەبەر جیاوازی سەرچاوە جێگەمان بۆ جیاکردەوە .

کە شیعرەکانی چاپەکە لەگەڵ دەســـــخەتێکدا بەراورد دەکەین نموونەی ئاڵۆزی‌و مەبەســـت ون‌بوونمان بەم شێوە دەست دەکەوێ :

١ ــ ئەم شیعرانەی خوارەوە لە چاپەکەدا ئاوان:

**یا وەکو ئولثی شـیرین‌و فەرهـــــاد**
**بەیتی حاجی لەبەرکرایـە بە یــــاد**
**ئیستە میللەت دەبوونـە صاحیب جا**
**یانــــە هـاوتایی ئەولیـــائوللا**

لە دەسخەتەکەیشدا ئاوان :

**صـــەد یەکی باسی شیرین‌و(١) فەرهاد**
**بگوتایە لە ڕێی مەعـــاش‌و مەعـــاد**
**ئیسنە میللەت دەبوونە صاحێبی جـاه**
**یانـــــــە هەمتـــایی ئەولیـــائوللاه .**

( گ : ٩٢ ، م : ٧ )

دەبێ بۆ دۆزینەوەی ئاڵۆز تۆزێك لەسەر ئەم دوو شیعرە بڕۆم‌و ، بۆ ئەو دۆزینەوەیە دەڵێم: لە گۆڕانی نیوەی دووەمی بەیتی یەکەمدا جوانی‌و ناســـکییەکی مانای شیعرەکان هەڵپـــڕووکاوە بێ ڕاستکردنەوەی شیعرەکەو هێنانەوەی بـــۆ سەر ئەسڵەکەی خۆی لەوانە نیە خوێنەر پەی پێ بەرێ‌و هەستی پێ بکات ، چونکە حاجی ، زیـــاد لە مەبەستی مانا شیعرەکە، جوانییەکی رواڵەتی وشەکانیشی مەبەست بووەو بە گوێرەی چاپەکان ئەو جوانییە لە بەین چووە .

ئەو جوانییە سنعەتی ( لەففو نەشـــری مورەتتەب )ە : دوو شتی لە شیعری یەکەمدا باس کردووەو لە شیعری دووەمدا دوو حوکمی ســـەر بەو دوو شتەی ــ بێ پاش‌و پێش ــ هێناوە ، شتی یەکەم لە شیعری یەکەمدا ( رێی مەعاش )ەو حوکمە بەرانبەرەکەرەی ( صاحێب جاه )ە . شتی دووەمی شیعری یەکەم ( رێی مەعـــاد )ەو بەرانبەرەکەی لە شیعری دووەمدا ( هەمتای ئەولیائوللاە )ە . وەك روونە ئەم مەبەستو مانایە لە شیعری چاپەکاندا لەکیسی چووە .

٢ ــ ئەم شیعرە لای ( گ ) ئاوا بخوێنەرەوە :

**یەکێ ( هاوتایی ) خۆمە خۆم دیبووم**
**شێخ وەسانی بوو ( پیاوێکی ) مەعلووم**

دوایش وەك دەسخەتەکەی ( م ) بیخوێنەرەوە :

**یەکێ ( هەمنامی ) خۆم بوو خۆم دیبووم**
**شێخ وەسانی بوو (مەردێکی)(٢) مەعلووم(٣)**

( گ : ١١١ ، م : ٤ )

پاش تۆزێك سەرنجدانی ئەم شـــیعرە دوو حوکمی نارەوامان تەنها لە گۆڕینی ( هـــەمنام = هاوناو ەوە ) بۆ ( هاوتا ) بۆ دەردەکەوێ :

١ ــ حاجی مەبەستی ئەوە بووە بڵێ یەکێکیان شاعیرێکی ( شێخ وەسانی ) بوو ، ناوی هاوناوی خۆم بوو ، خۆم دیبووم . کە ( هەمنام ) بوو بـــــە ( هاوتا ) ئەم مانایەمان لەکیس چوو .

٢ ــ بەگوێرەی ماناو واتای ( هاوتا ) دەبێ ئەو شاعیرە ( بە نەناسراو کراوە ) هاوتاو هاوشـــــانی حاجی بووبێت‌و پلەی شیعری‌ی لە پلەی حاجیدا بووبێ ، کە ئەمەیش لەوانەیە ڕاست نەبێ ، ئەگینا

ـ کە شاعیرەکە کۆن نییەو حاجیش دیویە ـ دەبوو شتێکی لێ بەجێ بمایەو باسێکی گرنگی ببوایە .

شایانی باسە ئەم گۆڕینە لە چاپی یەکەمی ( دیوانی حاجی ) دا کە چاپی ( عبدالرحمن سعید )ە نیە .

٣ ـ بۆ دوا نموونە ئەم شیعرە وەك ( گ ) بخوێنەرەوە :

**لازمە ( خۆڵ ) بخۆی وەکو بەرداش**
**هەموو قەرنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش**

دواییش وەك ( م ) سەرنجی بدە :

**لازمە (خول ) بخۆی وەکو بەرداش**
**( کوللی ) قەرنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش**
( گ : ٩٠ ، م : ٦ )

زۆر روونە کە ( بەرداش ) ، (خۆڵ) ناخوات! بەڵام دان دەهاڕێ ، وەك زۆر روونە کە ( بەرداش ) دەسووڕێتەوەو خول دەخوات تا ئاش ئاوی دەکەوێ یان ئەمێزێ .

لە بەر ئەم هۆیانە بە گوێرەی دەرەتان ئەو پارچە شیعرانەی حاجی لە دەسخەتەکەی ( مستەفا صائیب )دا هەیە لە گەڵ چاپی یەکەمو چاپی سێیەمدا بەراورد دەکەمو پشتیش بە کەشکۆڵی مەلا رەسوڵی تۆربەیی دەبەستمو ئەم نیشانانە بەکار دێنە . بۆ دەسخەتەکەی ( مستەفا صائیب ) ( م ) و بۆ چاپی یەك ( ع)و بۆ چاپی سێ ( گ )و بۆ کەشکۆڵی مەلا رەسوڵ ( ت )م بەکار هێناوە .

ئەمەیش باسێکی دەسخەتەکەی ( مستەفا صائیب ) ە :

ئەم دەسخەتە (١٧) لاپەڕەیە ، بە خەتی (م.ص) ، ( مستەفا صائیب ) ، لاپەڕەی یەکەمی بە مەرەکەبی سوورەو مێژووی ( ١٥ـ٢ـ٩٢١)ی بە سەرەوەیە ، لاپەڕەکانی کەی تا لاپەڕە (٦) بە مەرەکەبی رەشە ، ئەوەکەی بە قەلەمی رەش (رصاص) نووسراوە . ئەمانەتو وریایی نووسەری پێوە دیارە ، بەڵام لە هەڵەو کەمو کوڕی بەدەر نیە ، بە تایبەتی ئەو بەشەی کە بە قەڵەم نووسراوە گەلێ ماندوو دیارەو بە پەلەیش نووسراوەتەوە . هەوڵ دەدەم راستی ئەو هەڵانە دەربخەم .

لێکۆڵینەوەکەمان بە گوێرەی لاپەڕەکانی (م)دەست پێ دەکەینو ، بە گوێرەی زنجیرەی ئەو دەڕۆین .

**ـ ١ ـ**

**لە گاوانو شووانی کوردەکان یەك**
**بەسە بۆ لەشکری صەد کەڕە دوو لەك(١)**
**فیدای جووتیارتان بێ ( حاتەمی طەی )**
**بە قوربانی سەپانتان ( ئالی بەرمەك )(٢)**
**مریشکی ئێوە صەیادی شەهێنە**
**لە لای عەنقا فرووجە حاجی لەكلەك(٣)**
**شووانی مێگەلی کوردان ، لە شەڕدا**
**وەکوو قەصصابە دوشمن نێرەگەل شەك(٤)**
**لە گوێی گا نوستوون ، زۆر حەیفە بۆ شێر**
**لە سەر ئێوە وەها شێشگیرە وەك سەگ(٥)**
**صەلاحی ئێوە ئێستاکە سیلاحە**
**تەماعی گەورەیی بە چەك نەکەی نەك(٦)**
**وەکوو طۆفانە لەشکرتان ، بە پووشێ ،**
**هەتا وەك ئاگری ژێرکان لەگەڵ یەك(٧)**
**لە بەر حیزە بەخۆیی‌و ناتەبایی**
**لە ژێری حیزی حیزان بووینە دۆشەك(٨)**
**کراوە ئینتخابی وشکە صۆفی**
**لە دیوانی کەری بێ نوقتەیی شەك(٩)**

**ـ ٢ ـ**

**حەیاتم مەماتە کە لێم توند ئەبێ**
**مەماتم حەیاتە دەمی ئیلتیفات(١)**
**لەبی نازەنینی بە خەططی جەلی**
**لە ئێرانەوەی گرتووە تا هەرات(٢)**
**عومر گومەتی لەذذەتی داتەبی**
**تەکەڵتووی شکا زینی ئەسپی حەیات(٣)**
**لە غوربەت بە شاهی نە بیر ناکرێ**
**زەمانی جوانی‌و یادی ولات(٤)**
**طەماعم بو دونیاوو عوقبا بخۆم**
**ئەمم چوو لە دەستو ئەوم بۆ نەهات(٥)**
**لە ( قوشخانە ) وە تا دەمی ( ئیچ قەلا )**
**لە ( بابیز ئاغا ) وە تا مەحەللەی (قەلات)(٦)**
**هەموو خزمی خۆمن دەزانم دەڵێن**
**لە بێحورمەتیمان بوو حاجی هەڵات(٧)**

**پەراوێز :**

١ ـ بۆ کێشی شیعرەکە ( شیرن ) بخوێنرێتەوە رەساترە .

٢ ــ ڕەنگە ( مەردێکی ) کاتی خۆی ( مردکی = مەردەکی ) بووبێت و نووسەران ئەو گۆڕانەیان بەسەر هێنابێ .

٣ ــ شایانی باسە مامۆستا مەسعوود محەمەدیش لەسەر ئەم شیعرەی نووسیوەو ، پشت بە ریوایەتێك و بۆ چوونی خۆی ئەم شیعرەی وەك ئێمە نووسیمان ، راست کردووەتەوە. بۆ درێژی ئەم مەبەستە بڕوانە : حاجی قادر کۆیی ، مەسعوود محەمەد، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ،١٩٧٣. ل : ٦٥ .

**پەراوێزی شاعیرەکان :**

**ـ ١ ـ**

١ ــ شوانی (ع) : شـەوانی کوردەکان (ت) (کرکان!) دیارە هەڵەیەو (د)ەکەی لەبیرکردووە .

٢ ــ فیدای جووتیارتان بی ( ع ) : بە فیدای شووانتان.(گ) : فیدا گاوان و شووانتان. (ت) : فیدای جووتیاریان بێ بە قوربانی سەپانتان ( گ ) : بە قوربانی سوپاتان ! (ت): بە قوربانی سەپان .

٣ ــ ئێوە (ع) : ئەیوە لە لای ( ع ، ت ، گ ) : لەکن لەك‌لەك (گ) : لەگەڵگ . ئەم شیعرە لە ( ت )دا هەشتەمە .

٤ ــ کوردان (گ) : ئێوە (ع) : ئەیوە نێرەگەل ( ع ، ت ) مێگەل .

٥ ــ زۆر حەیفە بۆ شێر (ع،گ) بۆیەکە ڕێوی (ع) : بۆیەکە ڕەیوی . (ت) : بۆیەکی ڕێوی* شێتگیر (ع ، گ ) : شێرگیر .

٦ ــ بەچەك ( ع ، گ ، ت ) بێ چەك . دیارە (م): هەڵەیەو ( بێ‌چەك ) : ڕاستە .

٧ ــ وەکو .. تاد ئەم شیعرە وەك (ع) و (ت) دەنووسین :

هەتا وەك ئاگری ژێرکان لەگەڵ یەك
ئەگەر طۆفانە لەشکرتان، بە پووشەك

لە (ع) دا ( بە پووشێك ) نووسراوە بەڵام دیارە هەڵەیە . ئەو شێوەی (م)یش کە لە سەرەوە نووسیمان دەگونجێ ڕاست بێ . ئەم شیعرەو شیعری دوای ئەم لە (گ)دا نین .

٨ ــ بووینە (ت) : بوونە ، (ع) : بووین بە .

٩ ــ بێ نوقتەی (ع) : بێ نقطەی ، (ت) : بێ نقطە بێ .

**ـ ٢ ـ**

١ ــ توند ئەبێ (ع) : توون دەبێ ، (ت) : توند دەبێ ، (گ) : تووڕەبێ .

٢ ــ نازەنینی بە (گ) نازەنینی یە * لە ئێرانەوەی گرتووە ، (ع، گ ) : لە ئێرانەوە گرتوویە.

٣ ــ عومەر گومەتی (ت) : عومەر گونبەدی ، ( گ ، ع ) : عومەر گونبەتی .

٤ ــ لە غوربەت .. ( ع ) : لەغوربەت بە شاهی بە بیر دەکرێ (گ) : لە غوربەت کە شابی وەبیردێتەوە . ئەم شیعرە لە (ع و ت و گ)دا دوای ( طەماعم )ە .

٥ ــ طەماعم بوو (ع،گ) : تەمام بوو لە * چوولە (ت) : چووبوو * ئەوم بۆ (گ) : ئەمم بۆ .

٦ ــ بابیز ئاغاوە (گ) : بابیز ئاغا ، ئەمەی (گ) ڕاستەو ( وە ) کە زیادە .

٧ ــ بوو کە حاجی (گ ، ت ، ع ) : بوو حاجی ، بەڵام (م) ، ( کە ) کەی زیادەو هەڵەیە ،چونکە کێشەکە لەنگ دەبێ .

**سەرچاوەکانی ئەم باسە :**

١ ــ کۆمەڵە شیعر حاجی قادری کۆیی ، عبدالرحمن سعید ، بغداد ، مطبعە دار السلام ، ١٣٤٤هـ ــ ١٩٢٥م .

٢ ــ دیوانی حاجی قادری کۆیی ، گردو کۆو پەخشکار گیوی موکریانی ، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر ، ٢٥٨١ی کوردی ١٩٦٩ زا .

٣ ــ حاجی قادری کۆیی ، مەسعوود محەمەد، بەشی یەکەم ، چاپخانەی کۆڕی زانیار کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

٤ ــ دەسخەتی مستەفا صائیب .

٥ ــ کەشکۆلی مەلا ڕەسووڵی تۆربەیی .

★ ● ★

بەشی دووەم



# هێمن و بۆنی غەریبی

● محمد فریق حسن ●

بەشی دووەم

## مـەی و خەیاڵی شاعیرانە

له دووره ولاتیدا ، که ســــــۆزی غەریبی بەربینی دەگرێ ، پەنا دەباتە بەر ( مەی ) . مەی لای ئەم دووکەڵکێشـــــە ، پەژارەو خەمە پەنگ خواردووەکانی ناو دەروونی لێوە ســەر دەکەن . هــەروەها خەیــاڵێکی خۆشی دەداتێ . خەیاڵیش شتێکی پێویستە بۆ شــاعیر . بۆیە لە « ناڵەی جوایی »(٢١) دا ، کە یەکێکە لــە شـــــیعرە شاکارەکانی ، وەها دەستپێدەکا :

**ســاقیا ! وابادەوە ! وابادەوە**
**روو لەلای من کە بە جامی بادەوە**

بەم چەشنە دەبێتە مشـــتەری مەیخانە . نازدارێك شك نابا تۆزی غەریبی بۆ بسرێ . بــە خەیالی ( بادە ) ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە . ئــەو دێڕەی سـەرەوە چەند جارێك دەڵێتەوە . هــەر جارەی لە روخسارێکی نوێدا . بــەلای هێمنەوە ( مەی ) بۆ کەسێکی وەکو خۆی حەلاڵە !.. دەبا بزانین بۆچی

**مــەی حەلاڵــە بۆ منی وێرانــە مــاڵ**
**بۆ منی سەرگەشتەوو رووت و رەجاڵ**
**بۆ منی بــابــردەلــەی گردەنشـــــین**
**بۆ منی دڵ پڕ لــە ناســــــۆرو برین**

دیارە ئەم شیعرە جیاوازیی زۆرە لــە چــاو ئەوانەی لەوێ ، لە ماڵی خۆیداو لە ســەر پشت گوتوونی . چ وەکو چۆنێتیو چ وەك چەندێتی . بە تایبەتی ئەم شیعرە لە سەد دێڕ پترە .. بەلام ئەم هەڵکشانە رێی ئەوەم لێ ناگرێ رەخنە لـــەم چەند دێڕەی سەرەوە بگرم بەوەی هەست بــە ( مبالغە ) دەکەم . هێمن بەو رادەیەش پەرێشان نییە . دوای ئەوەش کەسێ خاوەنی نامــەیــەکی پیرۆز بێو لــە گەیــاندنی بێ ، ئەبێ چاوەڕوانی چەرمەسەرێش بکا .. هەر چۆنی بێ هێمن ئەگەر بــە لەش لێرە بێ ئــەوا بــە دڵ لەودیوە . یاخود موکریانێکی بچۆلەیەو لێرە رەشماڵێ هەڵداوە .

کە مەست بوو ، بە دەنگێکی نزم شـــیعرە خۆشــەکــەی مەولــەوی « مولانــا جلال الدیــن الرومی »(٢٢) دەڵێ : « گوێم بۆ هەڵخە حیکایەتت بۆ بکەم ، وەکــو حیکایــەتی ئەو نەیەی کــە لــە

ەستی خۆیان جودا کردۆتەوەو ، شەکوای حالێ خۆی دەکا » .

**جا کە سەرخۆش بووم بە دەنگێکی نەوی**
**بۆت دەڵێم : ئەو شیعرە بەرزەی « مەولەوی »**
**« بشنو از نی چون حکایت میکند »**
**« وز جداییها شکایت میکند »**

شاعیرمان ، بەو حسابەی پەروەردەی نەودیوە ، هەر دەبێ ئەدەبیاتی فارسی کاری تێکردبێ . ئەمەش شتێکی ئاسایییە . ڕەنگە زیاتر مەولەوی کاری تێکردبێ .. کە پەنای بۆ مەی بردو سەرخۆش بوو ، بۆ کەسێ دەگەڕێ حالێ لە حالێ خۆی بچێ . ئەو چارەیەش لە غوربەتەکەی مەولەویدا دەدۆزێتەوە . هەر لەبەر ئەمەشە کاری کردۆتە سەر هێمن و تێهەڵکێشی شیعری خۆی کردووە . حەزدەکەم رای تایبەتی مامۆستا هێمن خۆی لێرەدا تۆمار بکەم : « مەولەوی کاری نەکردۆتە شیعرەکانم ، بەڵام کاری کردۆتە دەروونم و هەژاندوومی . ئەگەر ئەو شیعرەی مەولەویم نەبیستایە ، باوەڕ ناکەم ــ ناڵەی جودایی ــ م وا بە رەوانی گوتبا » . هەر چۆنێ بێ شکایەت و ناڵەی شاعیر لە هی ( نەی ) تێپەڕاندووە . ئەم ناڵەی خۆی تێکەڵ بە هی مرۆڤایەتی دەکا :

**شیوەنی من شیوەنی ئینسانیە**
**بانگی ئازادی و گرووی یەکسانیە**

ئەم شیعرە ، نەوای مۆسیقایەکی غەمگینی تێدایە ، بەرزو نزم .. شاعیریش مرۆڤەو دڵێ ناسکە .

هێمن لەم دوور وڵاتی یە پتر لە جاران هانا بۆ کەلەپوور دەبا . دەیانهێنێتەوە گۆڕێ و کەڵکیان لێوەردەگرێ . هەندێ جار خۆی بە پاڵەوانانی بەیت و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان دەچوێنێ . ئەمەش وەکو هەوڵێک بۆ زیاتر نزیک کەوتنەوە لە کۆنینەو مێژووی گەلەکەی . ئەوێ کە بەلەش لە گەلەکەی دابڕاوە ، نەبادا بەبیرو پەیوەندیی رۆحی لێی دابڕێ . پێی لە زەمینەی خۆی بترازێ و لە حەوادا بمێنێتەوە .

هەر کەسێ بێ کەلەپوورو یادگار بژی شاعیر بێ ئەو شتانە ئۆقرەی نییەو لاوك بۆ رابوردوو دەڵێ ، ئێستای درێژە پێدانی ئەوسایە . هێمن ئەوەندەی ئاوڕ بۆ دواوە دەداتەوە ، نیو ئەوەندە کارەساتەکانی سەرجەمی دنیانایان بزوێنێ .

**کەوەمە نێو چاڵی دیلی وەك ( مەمێ )**
**( بایەزین ) لە کوێیە هاواری کەمێ ؟**
**کوا قەرە تاژەدین ( چەکۆ ) و ( عورفۆ ) لەکوێن ؟**
**بێنە هانام وەك پلینگی چەنگ بەخوێن**
**( لاسەشۆڕ ) یێك بووم غەنیمی دوژمنان**
**ئێستە ئەنگاوم بە تیری چلکنان**
**وا بە تەنیایی لە نێو خوێندا شەلاڵ**
**کوانێ عێل ؟ و کوانێ ( خانزاد ) و ( خەزاڵ ) ؟**

کە مەم خاتوزینی بووە ، لا س خەزاڵ و ، سیامەند خەج و ، برایم خاتوون پەریخان ، ئەم کوا ؟ کێی هەیە ؟ ئەگەر هەشبێ بەم چی .. ئەو لە کوێستان و ئەم لە گەرمیان ، چۆن دەنگیان بە یەکدا دەگات ؟ . ئەم شیعرە بەیتێکەو کۆمەڵێ بەیتی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە ..

هەرچەندە گەلێك جار ، لە سەرەتاوە وەکو پیرێکی لەرزۆکی چەماوە ، بە گۆچانێکەوە ، کونجی مەیخانان دەگرێ و دەست لە زۆر شت دەشوا ، بەڵام کاتێکت زانی خوێنی لاوێتی لە دەمارەکانیدا کفە دەکا . گوڕەکەی ئەوسای ماوە . کوڕەلاوە ، گۆچانی لێ فڕێداوە ، لە ڕیزی پێشەوەی کاروانداو بەڕێوەیە .

**دێم هەتا هەمبێ برستو بیرو هۆش**
**گەر گلاشم کوردەواری و ئێوە خۆش**

بەهۆی مەیەوە ، خەیاڵێکی شاعیرانەی دروستکردووە . لەو جۆرە خەیاڵانەی کە دوورن لە واهیمەوە . چونکە لە کۆتاییدا توانیوێتی خۆی لەو جاڕسی و پەرێشان حاڵییە قوتار بکا . واتە خەیاڵی بۆ مەبەستی خۆی بەکارهێناوە . نەك ئەم کەوتبێتە ژێر رکێفی خەیاڵەوە . « شاعیر کە بەخەبەرە خەو دەبینێ . بابەت خۆی بەسەردا ناسەپێنێ . بەڵکو ئەم خۆی بەسەر بابەتدا دەسەپێنێ . ئەمەیە جیاوازییەکە ، شاعیر یاری بە خەیاڵ دەکا . کەچی مرۆڤی تووڕەو نێربۆز ئەو کەسەیە کە خەیاڵ خۆی بەسەردا دەسەپێنێ »[٢٣] .

ئەگەر چی لە سەرەتاوە تا کۆتایی ، چەند جارێك هەست بە سەرکەوتن و تێكشکان دەکەین بەڵام بە زۆری لە کۆتایی شیعرەکاندا ئاسۆی هیوای روونە . ئەوی راستی بێ لەت و پەت بوون و بریندار بوونی دەروونی کەسانی ناو شیعرەکانی هێمن ، بێنەوایی و کڕووزانەوەیان ، حاڵی چەند کەسانێکی خەستە نین ، شاعیر هەڵبژاردبن .

یان زادەی واهیمەو خەیاڵی شاعیر خۆی بن . بەڵکو ئەوە حاڵی زۆربەیە .

ئەو بەرزیو نزمییانەی لە شیعرەکانیدا بەرچاو دەکەون ، جاریٚ ژێرکەوتنو جارێکیتر سەرکەوتنی ئاواتو ئارەزووەکان ، کوتمت لەو سەرکەوتنو ژێر کەوتنانە دەچن کە شاعیر لە ژیانی سیاسیو خەباتی نەتەوەییدا تووشیان هاتووە .

هێمن ، سوور دەزانێ گۆشەگیریو وەرەبەردان جاری زامەکانی ناکا . ئیتر خۆی ناخواتەوە . تا ئەو رۆژەی مۆمی تەمەنی دەکوژێتەوە ، ئامادە نییە چۆکدا بدا . بۆ ئەوەی بگاتەوە بە رۆژگاری خۆی، کاڵەی لێهەڵدەکێشێو نیازی گەڕانەوەی هەیە . بە وەفایە بۆ سەرچاوەکەی . کە گەڕایەوە بەیادی ئەوسای ( دەفتەر ) ، گەنج دەبێتەوەو کەڵ دەخا . سوورە لەسەر ئەو گەڕانەوە پیرۆزە ، بۆیە ( دێم ) زۆر جار دەڵێتەوە .

هەندێ جار هێمنی ( شاعیر ) وەرە بەردەدا دەسەوسانو تۆڵەوار دادەمێنێ . هەتا هێمنی خاوەن ( بیر ) بە پەلە پرووزێ فریای دەکەوێو دەست دەداتە باڵێ ، تا لەو گێژاوەی دەربێنێ ، ئەو خەریکە نوقمدەبێ .

ئەو ( من )ەی هێمن لە دێڕی شیعردا بەکاریدێنێ ، نیشانەی خودو کەسایەتی شاعیرە . لەهەمان کاتدا هێندە ئاوەڵایە ، جێی ( گەل )ێکی تێدا دەبێتەوە ، ئەمجا باوەش بۆ هەموو مرۆڤێکی کۆیلە دەکاتەوە . واتە لە ئازاری خۆیەوە بۆ هی گەلەکەیو ، لەوێوە بۆ ئازاری مرۆڤ .

لەو ( من ) انە لاریم نییە کە شاعیر بەکاریان دێنێو ، ناتوانێ دەسبەرداریان بێ . بە تایبەتی لەو شیعرانەدا کە لە دەوری خۆشەویستی دەسوورێتەوە . هەر وەکو چۆن ناتوانین شەخسییەتی شاعیر لە بەرهەمەکەی دوور بخەینەوە . « جا چی تێدا دەمێنێتەوە ئەگەر خودی شاعیرمان لە دێڕی شیعر دەرهێنا ؟! .. بەتایبەتی لە هی دڵداریدا .. ئەمە مانای وانییە دەمانەوێ کەسایەتیشی بسڕینەوەو لە کۆمەڵی دابڕین ؟ »(٢٤) .

خودی هونەرمەند بەر لە گشت شتێك – بەهرە – کەیەتی . بەهرەیەکی زیندوو ، هەمیشەییو رەسەن .. وشەی تایبەتی خۆی دێنێ ، لە شوێنی تایبەتیدا جێی دەکاتەوە ، بە شێوەی تایبەتی خۆی . لێرەوە جێدەستی نووسەر بە بەرهەمەکەیەوە دەبینین . دوای ئەوەیش « ئەوەی گۆرانی بە باڵای میللەتێکدا هەڵبدا ناکرێ تەنیا باڵ بێ ، بەڵکو کۆمەڵی لە دواوەیەو ، ئەویش باڵیپێوەدەنێ »(٢٥) .

هێمنی خاوەن بیر پێمان دەڵێ : گەل هەڵدەنووتێ ، تووشی شکست دێ ، بەڵام هەنگاوی دوای هەڵەنگووتن هەڵسانەوەیە .. هێمنی شاعیریش پێمان دەڵێ : ئەدەبیش لە تیژکردنەوەی ناکۆکییەکاندا رۆڵێ خۆی هەیە .

### ئارەقەی جوتیار

( ئارەقو تین ) شارەزایی تەواوی شاعیر نیشان دەدا لە ململانێ جوتیارو دەرەبەگدا . رەنجی بێبەری جوتیاران . هەناسەی ساردیان . دەست بڕینیان بە جۆرەها فڕوفێڵ. بیرکردنەوەی ساکاریان. سوور بوونیان لە سەر نوێژو رۆژوو. ئەم شیعرە کە بەتایبەتی لەسەر مەسەلەی جوتیاران دەڕوا ، بۆی هەیە ئەوانەی مەبەستیانە، کەڵکی لێوەربگرن . کەڵك لە ئەزموونی شاعیر .

ئارەقو تین ، شیعرێکی رەوانە . سازێکی ئاشنایە بەگوێ . جوانکارییەکی بەرز .. شاعیر گەڕاوە ، لە ژیانی جوتیاران ( لقطە )ی هەڵبژاردووە ، لێکی داونو توانیوێتی فلیمێکی کورتی گوزەرانی ئەوانمان بخاتە پێش چاو . رێچکەی ئارەقەی نێوچاوانی جوتیارو شانو قۆڵ کوتانی پاڵەو گەوزی داسی وەرزێری بەر فرچەی هەتاوی هاوینی تێدا دەخوێنێتەوە . دیارە گشت ئەو لەقتانەی تێکەڵ بە خەیاڵی شاعیرانەی خۆی کردووە . بەهۆی خەیاڵەوە « توانوێنی توخمەکان بە جۆرێك رێك بخا تا مرۆڤ بە ئاسانی ئەو پەیوەندییانە ببینێ کە جاران نا دیاربوون . بە شێوەیەک کۆیان بکاتەوە کە لەوەوپێش نەبوون »(٢٦) .

**پێش ئەوەی شەمی سەر چاکی**
**ئاخر فرمێسکی هەڵدەدێ**
**پێش ئەوەی گڕەبای تووڕە**
**ژیلەمۆی پەپوولە بەرێ**

ئەمجا دێتە سەر دژەکەی ئەو سەر کە ئاغایەو لە سای سێبەردایە ، پاڵی

ێ‌داوەتەوە سوورە ســـووری روومەتی دێ .. کوردەی جوتیـارەو بردەی ئـەو « ئالیوت لــەو بڕوایەدایە کە باشترین ڕێگە بۆ دەرخســــتنی ڕاستیی مەسەلەیەك ، وێنەگرتن‌و دەرخســـتنی دزەکەیەتی کە چەوتییە »(٢٧) .

**بەڵام حەیف ئێســــتاش لێرە**
**من برســــیم‌و کەسێك تێرە**
**نــە قــەت ئــارەقی ئەســـڕیوە**
**نــە قــەت گــەوزی هــەڵبڕیوە**

ئەم شیعرە وەکو ( بیر ) توێشـــووی زۆر پێیە . جگە لەوەش لەبەر داڕشتنە جوانەکــەی دەتوانێ سەرنجی زۆر ئەوەی دوای ئێمە بۆ لای خۆی رابکێشـــێ . تەنیا لەبەر ئەوە ئەم بڕیارە ئادەم گوایە لە سەر کێشمەکێشی جوتیاران دێتە وەڵام ، کە بۆ سبەی رۆژ دەســـتەچیلەو ئاگـر خۆش‌کەرێتی .. نەء ! .. چونکە بام شــــیعر خـــاوەنی فیکری خاوێنیش بێ ، بەس نییە بـۆ ئەوەی ببێتە شیعرێکی باڵا . چونکە ناکرێ لایەنە هونەرییەکەشی فەرامۆش بکرێ . بەڵکو لایــەنــە هونەرییەکە تەواوکەری لایەنە فیکرییەکەیەتی .

**گەشـــتێك**

**بــەنــــاو**

**یادگارەکاندا**

لە ( فریشتەی پەڕیوە )دا ، گەشتێك بەناو یادگارەکانیدا دەکاو شانازییان پێوە دەکا . هــەر بەو گەرم‌و گوڕییەی سەردەمی لاوێتی شیعرەکـە دەهونێتەوە . شانازی کردنیش بە رابوردووەوە مرۆڤ بەرەو نامۆیی کێش دەکا .

**لە مەیدان دیومە نێسکەی ئەسپی خۆش بەز**
**لەگەڵ دەستەو جلیتی شــۆڕە ســــواران**
**گەری شــــایی لەپێش چاوی گــەڕاوە**
**لەرەی مەم ، سووکە رەوتی گوێ بە گۆاران**

چاوەندازی جوان جوان لە ژیانی کوردەواری‌و بەســــەرهاتی شاعیر . لە وێنەی خەیـاڵاویدا ، لەگەڵ مۆسیقایەکی غەمگیندا ، بە سەر شاشەی بیرەوەرییەکانیدا رادەبوون . تا دەگاتەوە دۆخی ئێستای ، کە پیرو ماندوو بووە . بەڵام لە وشەی شیرینی کوردی زۆری پێ‌ماوە . ئەم بێزارییـە لەئێستنای‌و شانازی کردن بە رابوردووەوە ، لــە شوێنی تریشدا بەرچاومان دەکەوێ ، وەك لــە ( ناڵەی جودایی )دا ، دەڵێ :

**بوومە گەپ جــاڕو دەکـا گاڵتــان بــە من**
**ئــەو رەووزنــەی زەندەقی چووبــوو لەمن**

شیعری « گاوگەوردوون ، شەووشەیتان ، کاروانی خەبات ، لەبیرم مەکە ، بناری هەڵگورد » چیرۆکە شیعرن . بە زۆری باسی بەســــەرهاتی لاوێك دەکــەن لەگەڵ مەرگدا بەرەوڕوو بۆتەوە . لــە پێناوی مەبەســــتێکی گەورەدا بــەگژ بەرامبەرەکەیدا چووە . شاعیر نایەوێ چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە . بەڵکو مەبەستێکی پیرۆزی هەیەو گەرەکێتی روونی بکاتەوە .

**تــارمــایی**

**مــــردن**

ئادەمزاد کۆتایی‌یەکی تراژیدی هەیە . ئاوی حەیـــات بە کەس پەیـدا نەکراوە . شاعیر رۆژ تەمەنی هەڵدەکشێ . هەتا رۆژگاریش تێ‌پەڕێ لە مردن نزیکتر دەبێتەوە ، بام بەدڵ گەنجیش بێ . یاخود لەوەی دەترسێ بمرێ‌و بەکامی دڵ نەگات . لە « پەیامی رانەگەیەندراو »دا ، دەڵێ :

**گوتی سەبرت هەبێ دووبارە دیمە دیتنت ئەمما**
**لەکورتی‌دا تەمەن ، وا دیارە بەو دیدارە ڕاناگا**

لە ( عیشق‌و ئازادی ) دا ، ئەوەندە لە تەمەنی خۆی دەترسێ باوەڕی بەوە نییە شــــەوێکی تر بچێتەوە سەر مێزی بادە . یان مۆمێکی‌تر لـــە بکوژێنێتەوەو ساڵ نوێ بکاتەوە .

**لە بادە ئەم ژەمە تێرکە منی تینووی جگەر سووتاو**
**بەچی دیارە کە دەبینم شەوێکی تر ژەمێکی تر ؟**

بەڵام بام بزانین هێمن بۆ هێندە بــە تەنگ تەمەنەوەیە .. نیازی چیی پێی هەیە ؟

**خەبەر نیم بۆ تەمەن شێت بم بەکانی ژینی‌دا نووسێم**
**ئەوەندەم ژین دەوێ تا دەم دەنێمە نێو دەمێکی تر**

پێم‌خۆشە نەی‌شارمەوە کە ئەم دێڕەی لای خوارەوەی عیشــــــق‌و ئازادی ، لە وتەکانی رەسوول حەمزاتۆڤ ـ ی شاعیری گەلی ئاڤار ـ ی لەمەڕ داغستان دەچێ ، کە دەڵێ : « گەلەکــەی منیش رۆمیۆجولێت ـ ی خۆی هەبوو . کــە خەڵکی ئەم دونیایە هیچیان لە سەر نەبیستبوون، هۆی نـەبوونی شــەکسپیرێکی ( ئـاڤـار )ی بوو »(٢٨) .

**ئەما ( خانی ) هەتا چیرۆکی عیشقی ئێمە داڕێژێ**
**دەنا هێشتا لە کوردستان دەژین زین‌و مەمێکی تر**

**دووبـــــارە**
**کردنـــــەوە .**

حەزدەکەم ئەو دیاردەیەش ئاشکرا بکەم کە تایبەتە بەو شـــــیعرانەوە کە لەژێر کارتێکردنی غوربەتو دوور ولاتیدا گوتوونی . ئەویش دووبارە کردنـــەوەی وشـــەیەک یان دەســـــتەواژەیەک لەسەرەتای نیوە دێری شیعرەکانەوە هەرچەنـدە شتەکە دیاردەیەکی کلاسیکی شیعری کوردییە . بۆ نموونـە لە « ماچی خودایی » دا(٢٩) .. چـل جار ( وەرە ) دەڵێتەوەو شیعرەکە کۆتایی دێ . « ئەمەشیان بۆ ئەوەیە تاهەستی دەروونی بکەوێتە رێژگەی ئەو کێشەوە کە دەیەوێ هەســـتەکەی پێ‌دەربڕێ، هەروەها بۆ ئەوەی خۆ ئامادەکردنێکی دەروونی بۆ پەیدا بێ‌و رێگای بەردەمی تەختو زنجیرەی هۆنراوەکـە بـە نـەرمو لووسی بێتـە خوارەوە »(٣٠) .

**وەرە ! ئەستێرەکەی شەوگاری تـارم**
**وەرە ! یـارم وەرە ئەی تـازە یـارم**

ئەمەش خشتەیەکە بەژمارەی ئەو وشـــەو دەســـتەواژانەی کە شاعیر بە زۆری دووبارەی کردوونەتەوە .

**ئارەق‌و تین ـ**
٢٠ جار ( پێش ئەوەی ) ، ١٠ جار ( من )
٢٢ جار ( نە ) .
**بناری هەڵگورد ـ**
٧ ( جێ‌جێ ) ، ١١ (یەک) ، ٧ (هێشتا) .
**یـادم بکەن ـ**
٢٢ ( لەوەدەمەی‌دا ) ، ٤ ( یادی منی ) .
**ناڵەی جودایی ـ**
٢٣ ( ئەوکەسە ) ، ٣١ ( دێم ) .
**ئێوارەی پایز ـ**
٥ ( ئاخ ) ، ٤٢ ( بـە ) .
**دەسکەوتی خەبات ـ**
١٦ ( نـە ) ، ١٠ ( ئەوێستاش ) .
**مەتەرێزی شەرەف ـ**
١٠ ( لێرەش ) . .
**ماچی خودایی ـ**
٤٠ ( وەرە ) .
**شەوی شاعیر ـ**
٩ ( دەمەوێ ) .
**ترۆپکی رزگاری ـ**
٢١ ( دەرۆم )
**پەری شـــیعر ـ**
١٤ ( شیعرێك ) .
**گەرمـە شـین ـ**
٨ ( بـۆ ) .

**وێنــــەی**
**هونــەریی**

شیعر چ بە شێوەی ستوونی دارێژرابێ‌و چ پەیرەوی نوێی کردبێ هیچ لەو راستییە ناگۆڕێ کە هەمیشـە وێنەی شیعری بە یەکێ لەو ستوونانە دەژمێررێ کە بینای شیعرەکەی لە ســـــەر راوەستاوە .

هێمن ، لە دارشـــــتنی وێنەی هونەریـدا هێمنە . بەپێچەوانەی زۆربەی شـــــاعیرانی ئێستاوە ، کە بە شـــوێن یەکدا وێنەکان پێکەوە دەبەستنەوە ، بێ ئەوەی رەچاوی پەیوەندییـەکی پتەوی نەپســـــاو بکەن لـــە نێوان مرۆڤو سروشـــــتدا .. ئەو پەیوەندییە قووڵانەی ، خوێندەوارێکی ئاسایی هەستی بە بوونیـــــان نەکردووە . وەکو بڵێی لەم وێنە هونـــەرییـــە لاوەکی‌و بە هورووژمەیاندا مەبەستی یەکـــەمو کۆتاییان ماندوو کردنو سەرلێ‌شێواندنی خوێنەر بێ . کە هەرگیز ئەمە ئەرکی شیعر نییە .

هێمن ، وێنــەی بـە هورووژمی نییـــەو کەم ( ی )ی ئیزافە ریز دەکا .. لەو وێنانەدا کە هەڵیان دەبژێرێ ، پەیوەندییەکی قووڵ لە نێوان مرۆڤو سروشـــتدا بەدی‌دەکرێ . سروشـــتی کوردستان سەرچاوەی وێنەکانێتی . خەیاڵێـکی رێـك‌و پێـــك‌و رام‌کراوی دوور لـە هەڵچوونی سەرچڵانە ، لە وێنەکاندا هەست پێ دەکەین .

( چارەنووسی شاعیر ) یەکێکە لەو شـیعرە ئاسکانەی کە بە وێنەی هونەریی رازاوەتەوە .

**لە سەر بەفرێ بەکارنایە وەکوو بیستوومە داوێ‌رەش**
**لە سەر کوڵمەت ئەدی بۆ دڵگرە ئەوبسـکە تـاتـایە ؟**

شـــــاعیر گــەراوە لە دەوروبەری خۆی هەڵوێنجاوە .. پەیوەندیی یاران‌و هەورو خۆر ، لەگەڵ گریان‌و بارشــــــتیوی رەش‌و رووی دەزگیرانەکەی .. دژایــەتی نێوان هەورو با .. داوی دەزگی سەر بەفری سپی ، کا ئاشکرانەو نێچیری ناکری . لەگەڵ بـــــکی رەش‌و کولمەی سپی ، کــە ( دڵ ) دەبێتە نێچیری .. پیرەدار ، کە ناچەمێ‌و پیرەپیاو ، کە لە ئاستی جوانیـــدا وەکو تەمەی کۆچان دەچەمێتەوە .

لە ( پەیامی رانەگەیەندراو )دا ، کۆمـــەڵێ وێنەی جوانمان بۆ دروســـــتدەکا ، خوێنـــەر دادەچڵەکێنێ‌و ناچارە بـــە ســـــەرسامییەوە هەڵوێستەیەک بکا .

## هەتا کۆمتر دەبێ پشتم پتر هەڵدەکفێ مینی‌ژۆپ
## نیتر دەســـتم بەداوێنی کچی ئـەم شاری راناگا

شاعیر بەراوردێك لە نێوان خۆی‌و ( کــە روو لە پیریەو تا دێ پشـــــتی کۆمتر دەبێ ) لەگەڵ مینی ژۆپ ـ دا ( کە رۆژ بـە رۆژ کورتتر دەبێتەوە ) دەکــاو ئـەنجام ئیتر نـاتوانێ دەستەوداوێنی کچی ئەم شـــارە ببێ .. دیارە بەکارهێنانی ئەم وێنانە لە پلەی ئەســــتاتیکی شیعرەکە بەرزدەکەنەوە . لە لایەکی تریشـــەوە خەیاڵی بەپێزی شـــــاعیرانەی هێمن‌مان بۆ دەردەخەن « کە باسی شارەزاییەبە ئەستاتیکییەکە دەکەین ، مەبەستمان لە هەستکردنی مرۆڤە بــە سروشت ، هەستێکی قووڵ‌و بەپێز . بە رادەیەك بتوانێ هەرچی باســـــاو شتە تەباکان هـەیـە لەســروشـــــتدا ، بیاندۆزێتـــەوەو پێکـــەوە بیانگونجێنێ »(٣١) .

رۆژێکی وەکو ئەمڕۆ ، لە لێشاوی بەرهەمی سەدان شـــاعیردا ، پاشا گەردانییەکی تەواو دەبینرێ . ناچاری بە دوو دڵییەوە بۆ شیعرێکی رەسەن بگەڕێی . ئەویش تاکو تەرا بەرچـــاو دەکەون .. ئەمڕۆ رەسەنایەتی‌یەکە لە شـــیعری هێمن‌دا ئاشکرایە .

دەتوانم بڵێم : بـە چاوی خەیاڵی خـۆی وێنەکـــان دەبینێ‌و بــە زادەی بیری خــۆی دەیانهۆنێتەوە . ئەگینا لاسایی‌کردنەوەو خواستن‌و دووبارە دارشـتنەوەی شیعری بێگانە بە زەقی ، پرزەی شیعری کوردیی ئەمڕۆی بڕیوە . ئەگـەر تاکوتوویەک لــەم دیـاردە دزێوە قوتاریان‌بووبێ یەکێکیـــــان هێمنە . رۆدان ـ ی پەیکەرتاشی فەرەنسایی دەڵێ : « گەورە هونەرمەندان ئەوانەن کە بە چاوی خۆیان سەرنج لەو شتانە دەدەن کە خـــەڵکی پێش ئەوان دیویانە . دەشیـــزانن چۆن جوانیی بدۆزنەوە . ئەو جوانی‌یەی ســــەرنجی خەڵکەکەی بەر لە خۆیـانی رانەکێشـــاوە . هونەرمەندە بێ دەســـەڵاتەکانیش ئەوانەن کــە هەمیشــــــە چاویلکەی خواستەمەنی‌یان لـــە چاودایە »(٣٢) .

## بـــەرەو
## شۆڕشگێڕی

ئەگەر هێمن ، سەرەتا وەکو خوێن گەرمێك بە هەموو کەف‌وکوڵ‌و سەرکەشێتی ســـەردەمی لاوێتی‌یەوە ، دەســتی دابێتە هونەری شیعرو ، پێخۆری ســــۆزێکی نەتەوایـەتی رووت‌وقووت بووبێ‌و هیچی تر . لەمێژە دەتوانین بڵێین لـــەو سەردەمەی هەڵبواردووە . دوای ئەوەی چەندان هەورازو نشێوی دیوە ، لـە هەر تێك‌شـــکانێ ئەزموونێکی نوێی دەســـتگیر بووە .. لە تاك رەوی‌و سەرکەشێتی رزگاری بووەو پاڵی داوە بە پاڵی تویژێکی پان‌وبەرینـــەوە لـە جوتیـــاران‌و رۆشنبیرانی نەتەوەکەی ، رێك‌وپێکتر لە جاران‌و لـە پێنـاوی پەیرەوێکی دیــاری‌کراوو ئاواتێکی پیـرۆزدا دەرەنجێ . بۆیـە دەتوانین بڵێین لـــە یاخی‌بوونی تێپەڕاندووە ، رووەو شـــۆڕشگێڕی دەنگاو دەنێ . « سەرەتای گەشەسەندی هەموو هونەرێك بە یاخی بوون دەســـتی پێ‌کردووە . یاخی بوون یەکێکە لە خاسیەتەکانی هونەرو ، هەر وەهاش دەمێنێتەوە . بەڵام یاخی بوون پەیوەستە بە تاك‌رەوییەوە . خۆ ئەگەر شـــاعیر توانی لەو تاك رەوییە خۆی قوتار بکاو جەماوەر دوای خۆی بخا تاکو شوێن پێی هەڵگرن‌و ، لە رەوت‌و ئاستی کۆمەڵ‌و [illegible]رو گەیشت ، ئەو حەلە دەتوانێ بەرەو شۆڕشگێڕی بڕوات »(٣٣) .

**دوو**
**گلەیی**

**یەکـەم :**

لەگەڵ ئەم هەموو شـــیعرەدا کـە دوای کارەساتەکە گوتوونی ، نەیتوانیوە لە ســنووری کوردستان تێپەڕێ .. ئەوسـاوە ژمارەیەکی زۆر لە گەلانی ئاســیاو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتین لە چنگی داگیرکەر رزگاریان بووە . مێژوو دەیــان راپەڕینی دلێرانـــەی ئازادیخوازانی گـــەلانی بە خوێنی شــەهیدانیان تۆمارکردووە . ئێســـتاش زەوی لـــە ژێر پێی داگیرکەردا بووە بە ئاگرو ، رۆژ لە دوای رۆژ لە پاشەکشەدایە . هیچ کـام لەم شۆڕش‌و راپەڕینانە ســەرنجی شــاعیریان رانەکێشاوەو کاریان تێ‌نەکردووە . بۆیە شیعری بۆ نەگوتوون .

ئەمڕۆ هونەرمـــەنـدان بیانەوێ‌و نەیـانەوێ خۆیان لـــە ناو جەنگەی رووداوەکانی جیهـــاندا دەبیننەوە . بــە هۆی رادیۆ ، تەلـەفیـزیۆن . فاکسـمایل ، دەیان گۆڤاری ناوخۆو هەندەرانەوە ، کە ڕاستەو خۆو بێ پرس خۆیان لە رووداوەکان بخەڤێنین‌و ئاگامان لە سەرانسەری جیهـانــە .. کەچی شـــــاعیرێکی وەک هێمن ، تەنانەت نەیکردووە مەسەلەکەی ببەستێتەوە بە مەسەلەی گەلانەوە. جگە لە شیعری « کوردو ئازربایجانی » کە لە هەڕەتی کۆماری مەهاباد ـ دا گوتوویەتی . ئەگینا دوای کارەساتەکە ، لەو جۆرە شیعرانە بە میوانیش رێیان نەکەوتۆتە تاریک‌وروونەوە . لەوە دەچێ لــە کەســایــەتی نەتەوەیی خۆی نەیەتــە خوارەوە ! .. یاخود مەســەلەکەی خۆی هەموو شتێکی بیر بردبێتەوە . هەرچۆنێ بێ شـــاعیر لە بەرامبەر مێژوودا بەر پرسیارە . جارێکی تر ئەو کارەســـاتانە رووناداتەوە تاکو ئــەم وەک شاعیرێك لایان لێ‌بکاتەوە .. رەورەوەی مێژووش لەبەر خاتری ئەو ناگەڕێتەوە دواوە .

**دووەم :**

راســـتە شـــاعیر لە ئارەق‌و تین ـ دا ، موعاناتی ژیانی جوتیارانی کوردستانمان بۆ دەکاتە تابلۆ . جوتیارانیش زۆربەن . بەڵام شـــاعیرمان گرنگی‌یەکی ئەوتۆی نەداوە بەو چینەی بنیات‌نەری سبەینێ‌یەو جێی بڕوایە . بام ئەمڕۆکـــەش بــە تەواوی نەرسکابێ‌و لە سەرەتای گەشەکردنابێ ، شاعیر زۆرکەم لا لەم لایەنە دەکاتەوە . وەک لە ئاواتی بەرز ـ دا دەڵێ :

**تێك دەدەن کۆشکی بلیندی مفتەخۆری زگ زەلام**
**پالەو جوتیاری برسی ، کارگـــەری بێکاری کورد**

« مــادام هونــەرمــەد خۆی یەکێکە لـــەو کارگوزارە خێرخوایانەی بەشـــداریەکەی تەواو دەکەن بۆ پێك‌هێنانی کۆمەلگای نوێ . بۆیە لــە سەری پێویـستە گرنگی‌یەکی تەواو بدا بەوانـەی کە لە ریزەکانی بەرایبدان بۆ رەخســـاندنی ئەو پێشکەوتنە گشتی‌یە »(٣٤) .

ئەمە جگەلەو بێزاری دەربڕینەی.کە گەلێك جار شاعیر سەغڵەت دەکاو خۆی بە « بێ‌بژێو ، بەش‌خوراو ، پەروەریو ... هتد » . دەزانێ .. کە لە شوێنێکی تریش‌دا پەنجەم بۆ راکێشاوە . لەو باوەڕەدام شاعیر هێندەش بێ دەرەتان نییە .

لە کۆتاییدا ، رێزونەوازشـم پێشکەش بــە شاعیر دەکەم . بەوهیوایەی توانیبێتم رۆشنایبم خستبێتە سەر شیعرەکانی‌و راستیم پێکابێ .

**تەمموز ١٩٧٨**

**سەرچاوەکان :**


١ ـ دراسات معاصرة ، منشـــــورات المثقف الجديد (١) ، ص٦٧

٢ ـ مايكوفسكى ، شـــاعر الثورة الاشتراكيه ، جلال فاروق الشريف ، ص١٠٨

٣ ـ الواقعيه اليوم وابدا ، بوريس بوريسوف ، ص١١٧

٤ ـ تاریك‌و روون ٤ هێمن ، ل ـ ١٠

٥ ـ العبقرية في الفن ، الدكتور مصطفى سويف، ص٥٤

٦ ـ الاشتراكية والفن ، ارنست فيشر ، ترجمة اسعد حليم ، ١٩٧٣ ، ص١٤٠

٧ ـ گۆڤاری بەیان ژمارە ٢٨

٨ ـ الفكر الجديد ، العدد٢٥٩٠ ، مع الشـــاعر السوفيتي رسول حمزاتوف .

( ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ) نفس المصدر ص٩٠

١٤ ـ الادب والثورة ، غازي العبادي ، ص١٩

١٥ ـ النقد والنقد الادبي ، الدكتور رشـــاد رشدي ، ص٧٣

١٦ ـ دراســات في ادب الواقعيــة والواقعيــة الاشتراكية ، عبدالمطلب صالح ، بيروت ، ١٩٧٤ ، ص٨٩

١٧ ـ دیاردەیەکی ئەدەبی بوو ، دوای هەرەس هێنانی کۆمۆنە پاریس سەری هەڵدا .. ئەو نووســەرانە ، بەرهەمەکانیان مۆرکی جاڕس‌بوون ، نائومێـــدی ، ڕەش‌بینی‌و قێزەونییان پێوە دیاربوو .

١٨ ـ ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ( ٤٧ ـ ٤٨ ) تموز ١٩٧٧

١٩ ـ حرية الفن ، هدنور اورندول ، ترجمة : حسن الطاهر زروق ، بيروت ، ١٩٧٣ ، ص٧٧ ـ ٧٨

٢٠ ـ التفسير النفســي للادب ، الدكتور عزالدين اسماعيل ، بيروت ، ص٨٠

٢١ ـ گۆڤاری بەیان ژمارە (٢٠) .

٢٢ ـ گەورەترین شــاعیری ســۆفی‌ی ئێرانە . لەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا رووی لـــە ئەنەدۆڵ کردو لـە شـــاری ( قۆنیە ) گیرسایەوە . کـە بهاء الدین ـ ی باوکی کۆچی دوایی‌کرد ، ئەم بووە جێ‌نشـینی‌و جلەوی تەریقەتی مەولەوی گرتەدەست . مەولەوی بە زمانی تورکیش شـــیعری ســـۆفییانەی گوتووە . بە یەکێك لـــە پێشـەواکانی شیعری تورکیش دەژمێردێ. بروانە : الادب التركي الحديث والمعاصر ، محمد حرب عبدالحميد ، مصر ، ١٩٧٧

٢٣ ـ التفسير النفسي للادب ، ص٣١

٢٤ ـ لحن الحرية والصمت ، الدكتور عبدالغفار مكاوي ، ص٨٦

٢٥ ـ واقعية بلا ضـــفاف ، روجيه جارودي ، ترجمة : حليم طوسون ، ص١٢٣

٢٦ ـ الابداع وتربيته ، الدكتور فاخر عاقـل ، بيروت ، ١٩٧٥ ، ص٧١

٢٧ ـ التجربة الخلاقة ، البروفسور س.م بورا ترجمة : سلافه حجاوي ، ص٢٠٨

٢٨ ـ الادب في المعركة ، نقلهـــا الى العربيـــة ، الدكتور جليل كمال الدين ، بغداد ، ١٩٧٧ ص٤٧

٢٩ ـ هاوکاری ، ژمارە ( ٣٠١ ) .

٣٠ ـ ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیـــدا ، عەزیز گەردی ، بەرگی دووەم ، ل٤٩

٣١ ـ الفنان والانسان ، دكتور زكريا ابراهيم ، ص٧

٣٢ ـ نفس المصدر ، ص١٧٤

٣٣ ـ المنفى والملكوت في شعر عبدالوهاب البياتي شـــــوقي خميس ، بيروت ١٩٧١ ، ص٢٠ ـ ٢١

٣٤ ـ الفنان في عصر العلم ، ترجمة : فوءاد دواره بغداد ، ١٩٧٧ ، ص٧٥ .

لەڕای ئێمەدا ، هیچ جیاوازیەك لە نێوان داگیرکەرێك‌و داگیرکەرێکی ترا ، نیە

صدام حسين

# شیعری نوێ یان داڕێشتن بەسەر ڕێڕەوی پوختەدا



نووسینی: ئەلفاریز
وەرگێڕانی: محسن ئاوارە

**ف.ر. لیڤز لە ساڵی ١٩٢٣دا بە دیاری خست کە ( ت.س. ئەلیوت و ئەزرا پاوند ) هەڵساون بە داڕشتنەوەی ئەدەب ، دوای بیست ساڵ لە پاش ئەم مێژووەدا گەڕاونەتەوەو قسەکەی خویان کێشاوەتەوە ، هەموو گلەییەکانیان خستوتە سەر ئەو کارە ئەندیشەییە بەتاڵانەی کە لە گیانی ڕەخنەی ڕاستگۆییانەوە بە دوور بوونە و بە تەواویش شاباڵی بە سەر وێژەی کۆمەڵگای ( لەندەن )ی ئەوسادا کێشا بوو ، هەروەها بەسەر جەماوەر و خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکانیانیشدا .**

**دیارە لیڤز هەقی بووە لەو تۆمەتەی کە بە باڵ ڕەخنە گرەکانی ( لەندەنی ) داوە کە گوایە چەندان خواوەند و پەیکەری نادروستیان دروست کردووە ، بەڵام تا ڕادەیێ لە سەرنەکەوتنی بەهرەکانیاندا ئەمەیان بە تەواوی شتێکیترە ، ووتەکە لە سەر نەزانینی چۆنیەتی بەکارهێنانی بەهرەکەوە دەوەستێ .**

لە ( لێکۆڵینەوەیەکدا بە ناونیشانی « گیانی داڕشتن » لە ساڵی ١٩٥٨ ) دا جارێکیان ووتم ئەو شێوازە تجریبیەی ( ئەلیوت )و کەسانیتر لە ئینگلترەدا ناخەملێ ، چونکە ئەمانە لە ڕەچەڵەکدا ئەمریکین و بە نیازی درووست کردنی زمانێکی تایبەتین بۆ شیعری ئەمریکی .

ئەلیوت خۆی خستۆتە ناو بازنەی دەسەڵاتداریەتی ناوچەیەکیتر ، ئەمریکیە و بەڵام کاتی خۆی بە « ئینگلیزی ـ کاثۆلیك لە دیندا ـ پادشارەوی لە سیاسەت و ـ کلاسیکی لە وێژەدا » بە دیار خست لە بەر ئەم هۆیانەوە کۆمەڵەی جولانەوەی شیعری بەریتانی وایان لە لا کەوتەوە کە تەرازووی تجریبیەت ڕاست بکەنەوە ، ئەگەر چی لەو بڕوایەش نەبوون کە بەم جۆرە سەر هەڵدات .

لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا ( توماس هاردی ) بە ( روبرت جریفزی ) ووتووە ـ هۆنراوەی ئازاد ـ لە ئینگلترەدا هیچ بە هیچ ناکات .

**« هەموو ئەم شتانەی دەتوانین بیکەین ئەوەیە بە شێوەیەکی کۆنینە لە بارەی بابەتە کۆنەکانەوە بنووسین ، بەڵام ئەوەی لە سەر**

**ئێمە پێویستە ئەوەیە لە نووســـــینەکانی ئەوان هەندێك باشتر بنووسین » .**

لە سالی ( ۱۹۳۰ )شدا ڕێڕەوی کەرستە شـــــیعرییەکانی بەریتـــــانی وای لێ هـــــات دەسەڵاتداریەتی خۆی بە جورێ بخاتە کار کـــــە ببێتە خۆراکی کۆمەڵێك نادروستیو پاشەکشەیی، و. لە کۆتایی کاریشدا بمانگەیەنێتە هەمان ئەنجامی ووتەکەی تۆماس هاردی .

دوا بەڵگەنامەی ( تجریبیەت ) تەنیا لە سەر تەکنیکەوە ناچەســـــپێت ، بەڵـــکو لەوەوە رەت دەکات .

●

نوێ خوازە گەورەکان کاتێ ( تجریب )یان بە کار هێنا تەنیا بۆ تازە کردنەوەی ڕووخســـــار نەبوو ، بەڵکو بە نیازی ئەوەی شیعریش ڕاکیش بکرێت بۆ ئـــەو نـــاوچـــــە نوێیانەی کـــــە بـــــە تاقیکردنەوەی مرۆڤایەتیدا تێپەڕ دەبن ، وە ئەو سەرکەوتنە قووڵانەی نووسەرە روایەتنووسەکان وەدەستیان هێناوە وەکو ( ـ ملڤل و دستویفسکی و لورنس ، هەتا ـ هاردی ) ـ لە پێناوی ئەوەی کە لە شیعریشدا ئەم کارە مەیســـــەر بکرێت ، کەچی بە کۆمەڵێك ئەنجامی خراپ گەڕایەوە لـــــە پاشاندا بووە هۆی وەستاندنی .

مێژوو نووسەکانی ئەدەب بە ڕای جیا جیا ســـــەیری ئەو ڕووداوە دەکەن بە تایبەتی ئەدەبی ئنگلیزی کە شـــــێوازی خۆی هەیە لـــە بەرەو پێشەوە چوونی بۆ ناو مێژووی وێژەوە .

ئەو شـــــەڕەی کەوا لە نێوان پەككەوتەیی ئەدەبیدا دەسوڕێتەوە کە لە دوورەوەشـــــا بـــە گەورەییەوە دیارە ، دەئاخنێتە نێو ســـــەردەمی ململانێی قوتابخانـــە شیعریەکانەوە ، وە مێژوو بە تەواوی لە ســـەر ڕووداوەکان رێك دەکەوێت ئەگەر چی هەندێك نادروســـــتیو لایەنگیریەتیو نارەوایی لێ بەدی دەکرێت .

بە دەنگەوە هاتنی شاعیرەکانی ســـــەردەمی بیستەکان ئەوەی سەلماند یان کاتیان بەدەستەوە نیە تا شیعری ئالوز بنووسن ، یان بێن بە دوای قولایی خود ( ذات )دا شۆڕبنەوە ، یان بـــە دوای ( تجریبیەکان )دا بگەڕێن .

زۆر لێ کردنێکی توند هـــەبووە لـــــە رووی هەلوێـــــستی رامیاریەوە ( ئودن ) ئالای ئـــەم هەلوێستەی بەرز کردەوە ، هەڵسا بـــە تێکەڵاو کردنێك لە نێوانی کارامەیی لە تکنیکێکی بەهێزدا لە گەڵ بەکار هێنانی نموونە تقلیدیەکان ، هـــەر وەها لە رووی بەئارهێنانی توانستی هەڵبژاردەدا، وە بەکارهێنانی دەربڕینە تازەکانی سەردەم .

وە خۆی لەو بڕوایەوە بووە کە گۆڕانکاریەکی نوێی خستۆتە سەر زمانی ئینگلیزی ، بۆ نموونە لە هۆنراوەی ( گەورەم ، مرۆڤ دوژمنی نیـــە ) زمـــانێکی زانیاری و دەروونی رۆژگارێکی نوێ و هەروەها لەم هۆنراوەیەدا ئاشکراو روونە کـــــە بە ناونیشانی ( کرێکاری ـ کان ـ ئالودەی سەگی دوورەگە ، وەکو شەوی تاریك ) .

وە لە هەڵگیرانەوە و بنیاتنانی شـــــیعری گۆرانیدا کە لە ســـــەر ڕێنامەی « گەورەم ، بۆ کوێ دەڕۆین ؟ » ، زاراوەی سەردەمانە و دوور لە دەربڕینی ڕۆمانسیانەوەی بەکارهێناوە کە لـــە دیبای پیشەسازییەوە سەری هەڵداوە ، بـــەڵام گیروگرفتی ( ئودن ) لە کارامەیدا زیاد لە پێویست بووە ، وە لە رووی ســـــەیرکردنی بۆ هونەری شیعرو هونەری سەرهەڵدان وەکو یەکەوەی بـــە لاوە ئاسان بووە .

هوشیاری ئودن لەوەدا بووە کە توانیویەتی زۆر بە پڕ تواناییو هەستیاریەوە مامەلە لەگـــەڵ گیروگرفتەکانی سەردەمی خۆیدا بکات و بـــــە چاوگەی ئاشکراو روون بکات ، وە بەو شـــێوازە گشـــــتیانەی کە لە ناو کۆمەڵەکەیدا هـــەبووە بەکاریان بهێنێ کە هەر ئەوەش بوو ، بووە هۆی ئەوەی هۆنراوەکانی سیمای کۆمەڵایەتی پێوە دیار بێت هەر چەندە لە رووخـــــار دا زۆر دووبـــارە بوونەوەی تیایە ، بەڵام چاوگەی هۆنراوەکانی بـــە هێز و سەردەمانەن .





نموونەکانی ( ئۆدن ) کۆمەڵێك لەو ڕژێمیانەی هان دان کە بڕوایان وا بوو ، نوێ بوونەوە ، واتە پیا هەڵدان و خۆدەرخستن بێ ئەوەی گرنگی بە ڕەسەنایەتیەوە بدرێ ، « لەمانە جگە لە ـ لویس ماکنیس ـ نەبێ کە لە هۆنراوە رامیاریی‌و کۆمەڵایەتیەکانیدا هەتا لە هۆنراوەکانی ( ئۆدن ) قووڵ‌و کاریگەر و بە هێزتر بووە » .

**بەم جۆرە لە سییەکاندا ووڕژمی ( تجریب ) کۆتایی پێ هات‌و شەپۆلی‌تر بە بەرگێکی بریقەدار و نوێ‌و ڕازاوەتر شوێنی گرتەوە . ئەمەیان یەکەم ( کاردانەوە ـ رد فعل ) بوو کە بە خراپە شکایەوە . دوای ئەمە بە جۆرێ کاردانەوەی دژ بە ئۆدن پەیدا بوو بەرامبەر بەو کارانەی کە هێنابوویە کایەوە هەتا شێوەی ( ڕەتکردنەوەی ڕۆشنبیریی ) وەرگرت .**

**واتە تەماشای ( ئۆدن )یان دەکرد کە شاعیرێکی بە تواناو کارامەیە ، بەڵام بە وێنەیەکی تەواو ئەو سۆزە بەتینەی نیە کە لەگەڵ بارو زروفی سەردەمی چلەکانی سەختدا بیرەخسێنێ .**

**بە زمانێکی دوانگەییەوە ( خطابة ) شەڕێکی گەرمی هەڵگیرساند کە زۆر ڕکەو بەرزو تەمو مژاوی بوو ، کەچی لە چلەکاندا ، گلۆربوونەوەی قەدە دارینەکان لە دۆخی سەرخۆیی‌و هێمنییەوە لەگەڵ دۆڵ کوتنیدا گۆڕاوە .**

**( دیلان تۆماس ) مامۆستای ئەم هەڵوێستەیە ، بەڵام ئەوە هەیە تۆماس خاوەنی بەشێکە لە ڕەسەنایەتی لە تەك ئەوەی کە شاعیرێکی دوانگەیی بووە ، وە بەردەوامیش لە ژێر پاڵەپەستۆی « ئەفسەری پەیوەندیە گشتیەکان » دا بووە لە بری ئەوەی کە لە شاعیریەتی کەم‌کاتەوە ، بەڵکو تەنیا وەکو شاعیرێك بەردەوام بێت لەو ڕووە سرووشتانەی بۆی دێت ، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە دەستی لە کارەکەدا هەبێت ، ئەوەش ئەمە دەگەینێت کە لە سەر سیفەتی دوانگەییەوە بەردەوام بێت و بەس .**

•

ووردە ووردە بانگەوازەکانی تۆماس پووکایەوە ، وە لە پاشاندا بە رووخاندنی خودی ( ذات )ی شاعیر کۆتایی پێ هات .

قوتابیەکانی ( تۆماس ) بە ناوەڕۆکو فۆرمێکی بێ‌مانا هاتنە مەیدانەوە بە جۆرێ لە شیعری تۆماس‌دا دوور کەوتنەوە ، چونکە هەموو خەمەکانیان تەنیا ئەوە بوو کە هۆنراوەکانیان کاریگەر و سەرنج ڕاکێشی‌و بەرچاو بێت .

ئەمەش ( کاردانەوە ـ رد فعل )ی دووەم بوو کە بە خراپە گەڕایەوە لە رووی دروست کردنی دیوارێکی دژ بە زیرەکی .

دوای ئەوە قۆناخی سێیەم هاتە پێشەوە کاردانەوەی نوێ‌تری بەرپا کرد لە دژی ووڕژم‌و هەڵچوونی [illegible] ، کە ناوی ( جولانەوە ـ حرکە [illegible] ) ، وە لە هەڵبژاردەکانیاندا لە شیعری ( روبر ، گرنکوست )دا بە ناونیشانی ( رستەکانی نوێ ) وە نموونەی بەدیار کەوت .

لە نێو ئەو نۆ شاعیرانەی کە لەم کۆمەڵەدا بوون ، شەشیان مامۆستای زانکۆ و دووانیان فەرمانبەری پەرتوکخانە و دووانیشیان فەرمانبەری میری بوون .

بە جۆرێ ستایشی شیعرەکانیان دەکرد کە گوایە بە ( ئەکادیمی ـ فەرمانڕەوایی ـ هەستیاری ـ هۆشمەندی ـ کارامە ـ ڕازاوە ـ هەروەها بەرزیش بە شێوە تایبەتیەکەی )یەوە دەناسرێتەوە .

بەڵام لە رووی دۆزینەوەی لایەنی ئیجابی بە گرانەوە دەوەستێ بۆ ئەوەی بتوانین دەستنیشانی بکەین ، هەتا کۆکەرەوەی هەڵبژێری شیعری ئەو شاعیرانە هیچی لە هۆنراوەکانیاندا بەدی نەکرد تا لیوەی بدوێ ، تەنیا ئەوە نەبێ

لەگەڵ رەتکردنەوەیانی‌دا باسی دەکاتو دەڵێت : " ئەو جۆرە شیعرانە ناچنە ژێر رکێفی بناخەی تیورە گەورەکانەوە ، بەڵکو لە ژێر باڵی ( لا وعي )یەوەیە ، زۆریش لەدواندنو سۆفیگەریەتی‌دا بە دوورە ، وەکو فەلسەفەیەکی نوێش ، بە هەڵوێستێکی تجربیانەوە بەرامبەر بە هەموو شتێکدا دەوەستێ ، وە سەیر دەکەین لە رووی بنیات نانی تکنیکو زمانێکی روونو سادە بە دوور دەکەوێنەوە و رەتیشی دەکەنەوە .

هەر لە یەکەم روانین‌دا ، دەبینین نامان گەینێتە ئەو بڕوایەی کە وەك قوتابخانەیەکی تەواو بە پرۆگرام و تابلۆی بەرێوەبەریەتی‌یەوە لە ناو ئەو کۆمەڵەدا دروست بێت ، وە ئەو شتانەی کە ئەم شاعیرانە کۆدەکاتەوە ، رادەیەکی زۆر سەرەتاییەو بە نەخشە کێشانێکی خراپەوەش دێنە پێشەوە بۆ نەهێشتنی بیرو ڕایە خراپەکان » لەو بڕوایە دامە کە کونکوست راست ناکات ، کاتێ دەڵێت ئەوەی هاوبەشیەتی بێت لە نێوانی شیعرەکانم‌دا نیە ، ئەو نموونەیەتان دەخەمە بەر چاو :

**« وێنەی دڵداریێ ، یان هاوڕێ**<br>
**کە نە لە شێوەی تۆ دەکات ، نە لە منیش**<br>
**بەڵکو ئێمە ئاگاداری شێوەکانمان بین**<br>
**پێویستیمان بە شەرابو گفتوگۆ و ڕەنگو ڕووناکی هەیە**<br>
**بە کورتی ، پێویستیمان بە ڕابردووێ هەیە**<br>
**کەس تیایدا بەشداریمان لە گەڵدا نەکات**<br>
**دوا رۆژت هەر چۆنێك بێت ،**<br>
**ووشك ، لەسەرەخو ،**<br>
**لە هیچ کەسێکەوە زیاتر بە ( جنس )ەوە خۆشنود نابم**<br>
**ئەوەشم نیە ،**<br>
**سینگ دەرپەڕێنم و بە ناوی ئاسمانەوە دەنگ هەڵبڕم**<br>
**ئەو هۆشەی کە پێویستی بە هیچ کەسێکەوە نیە ،**<br>
**بە بیری بێنێتەوە ،**

**لەو نیشانە کەمە و دژوارانەی ، کە هەمان ڕواڵەتی دژوار و بە تەنگەوەی پەڕاندنەوەی خۆمان و خێزانەکانمانە ، وا دیارە ، شاعیر هەڵەیەکی کرد »** .

قسە کردن لە سەر ئەم هۆنراوەیە ، وا دیارە هەندێك تەمو مژاوی‌یە ؟ هەندێك تەنگە نەفەس بوونی تیایە ئەگەر بە دوایەوە بکەویت ؟ ناوەڕۆکەکەی بە ووردەکاریەکی زیاد لە پێویست نەخشە دراوە ؟ بەڵێ هەر خۆی بۆ ئەوەوەیە . ئەم شیعرە ( ئاوێتە کراوە ) هەندێك لە وێنەو رێچکەی شیعری هەشت شاعیر لە نێو ئەو نۆ شاعیرانەی تیایە کە لە هەڵبژاردەکەدا بوون ، بەڵام تەنیا هۆنراوەی ( د. ج. ئەنرایت ) دانەندراوە لە بەر ئەوەی وەکو ئەوانی‌تر خۆی بە ( کێشە )وە نابەستێەوە کە زۆر رژد بوون لە سەر ئەم مەسەلەیە . جگە لەمەو من هیچ زیادەیەك ناخەمە سەر ئەو دێرە شیعرانەی لە نار چووینە لە کاتی کۆکردنەوەدا .

ئەم شاعیرانە وەرگرت بەو پێیەی کە لە رێکخستنی هەڵبژاردەکەدا ریز کراون ، وە لە هەر هۆنراوەیەکیان دوو دێرم هەڵبژارد بە بێ ئەوەی هیچ گۆڕینێك لە نێوانی خالو دێرەکان‌دا بکەم وە ئەم شیعرەش زۆر روون نیە بەڵام شێوەی یەکیتی بابەتەکەی تیایە ، هەر چەندە بۆ خوێندەوارانیش بە گران دەوەستێ ، لە بەر ئەوەی وەرگێراوە و خوێندەوار نازانێ لە کوێوە دەست پێ‌دەکاو لە کوێوەش کۆتایی پێ دێت .. ؟ پێکچونێکی گەورە نابینێ لە زمانو تافی‌کردنەوەدا .. ؟ ئایا دیسان یەکیتی لە رووکاری‌دا دەبینێ .. ؟

ئەو جۆرە ستایشانەی کە لە لایەن ( جولانەوە )دا بەدیار دەخرا لە رووی



ئەقواگەریەوە بە ئاسانی دەرکی پێوە دەکەین هەر وەکو لە شیعرە رامیاریەکانی شاعیرانی سەردەمی سییەکاندا بە دەرمان خست .. ؟

بە کورتی تەقواگەریەتی ( جولانەوە ) لە سەرەتای هۆنراوەی ( فیلیب لارگن ) وە دەبینین کە بە ناونیشانی « بەرەو کەنیسە رۆیشتن »دا دەڵێت :

**سەرەو رووتە**
**تۆری دووچەرخە ( پاسکیل ) داکەنمو ...**
**جێگای ریزە**

ئەوە بوو بە شێوەیەکی ئاراستە کراو وێنەی « وولاتێکی ئاسودە »ی ئینگلیزی ، کە پیاوێکە گرنگی بە جلو بەرگی رێکوپێك نادات ، هەژارەو گرژە ، چونکە پاسکیلی هەیەو ئۆتۆمبیلی نیە ، رەقە بەلام پڕ بووە لە تەقواگەریەتی بێ ئەوەی پاکانە بکات ، دەچەوسێتەوە لە بێ گوزەرانیو موچەی کەمو باجێکی زۆری بە سەردا سەپێندراو ، بێ هیواو بێزارە ، ئەوەش ( کاردانەوە ـ رد فعل )ی سێیەم بوو .

ئەوەی کە کردم هەوڵدانێك بوو چونکە وام دەهاتە بەر چاو کە شاعیر بە پێچەوانەی وێنەی پیاوێکی سوتاو و ئاوارەیە ، کەچی ئاسایە وەکو ئەو پیاوەی لە تەکمانەوە دادەنیشێ ، بەلکو لەم رووەوە راستیەکەی ئەو پیاوەیە کە لە تەنیشتمانەوە دانشتووە .

من هەر خۆم وەکو کەسێك حەز دەکەم شیعر بگەرێتەوە بۆ ناوچەی هەستێکی ئیجابیەوە، بەلام پرسیارە و خۆی دەردەخات هەستی ئیجابی دەبێت چۆن بێت .. ؟

ئەو سێ کاردانەوە سلبیانەی کە لە پێشەوەدا باسم کرد ، رێگاکانیان لە یەکەوە جیا بوو ، چونکە لە بری ئەو گوتەیەوە دەپارێزرا کە ئینگلترا دەژی و دەژی هەر وەکو لە پێشدا ژیاوە، لەگەڵ ئەو گۆرانکاریە ئاسانانەی کە لە پەیرەوی چینەکاندا کراوە . ئەو نموونە بەرزانەی کە رووگە و رەوشتی لایەنە بەرزەکانی چینی ناوەندی نیشان دەدا و گیانیانی وەبەر دەخست ، ئەو نموونانە بوون کە بە ووردی ( جون بتجیمان ) وێنەکانی بە دیار خستو زۆر رێگای بۆ نموونەیتریش کردەوە لەو نموونە جیهانیانەی کە لە ناو چینە فرەوان و بەهێزەکاندا هەلقولاوە یان کرێکاران .

ئەمە بوو رێرەوی ( جولانەوە ) یان ( تورە بووەکان ) کە بەدیار کەوت .

نەزاکەتو رەوشتی بەرزیش بە شێوەیەکی گشتی دەربرینە لە بڕواێکەوە واتە ژیان بەرەو رێكو بەدی دەڕوات ، خەڵکیش بە رەوشتو هوشیارن . هەڵچوونیان گونجاوە و دەکەوێتە ژێر دەسەلاتداریەتی خۆیانەوە ، بە کورتی خوا بەرەی خێرە .

ئەو هەڵوێستو شێوە ئیلتزامە کارێکی گرانە ، وە تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتنی ئینگلیز بۆ ئەوە دەگەرێتەوە چونکە ووڵاتەکەیان لە دوورگەیەکی دوور خراوە بوو ، وەکو کرداریش لە هەموو دونیایتر دوور بوون ، بەلام لە کۆتایی شەری دووهەمی جیهانیدا ، ئەم دوورە پەرێزیەی بەرەو نەمان رۆیشت .

هۆنراوەکەی ( روبرت جریفز ) ـ خوا حافیزی لەم هەمووانەوە ـ بە شێوەیەکی گشتی رەنگدانەوەی بێ دەسەلاتیەتی لە بەرامبەر بەرنگار بوونەوەیەکی تقلیدیانەو دەستە پاچەیی .

کەچی لە کاتێکدا کە بارو زروفێکی پەککەوتەو زۆر سەخت هەبوو ( روبرت ) زۆر بە چەپۆکیو هێزمەندانەوە خۆی راگرتو بەرگری کرد . منداڵیەتی شاعیر ، لەو وەختانەی کە کۆتایی بووە لە قوتابخانە سەرەتاییە گشتیەکاندا واتە بە نسبەت ئەوەوە ـ تەنیایی ـ نەخوێندەواری ـ داهێزرانی رەوشت ـ دڕیو چەتوونیو گەمژەیی ـ ئەم هەموو شتانە کە وەکو منداڵێك لێی رەچاو دەکرا ، بەلام ( جریفز ) بە شێوەیەکی توندو تیژ رەتی کردنەوە ، لە شوێن ئەوەدا بە شتیتر دایشکاندەوە وەکو ـ یاری وەرزش ـ بەهێزکردنی ماسولکە ـ ئەڤینێکی دوور لە جنسەوە ـ .

جریفز کە سەرنج راکێشیو جوانو پاکو بەرچاو بووە ، ئەگەر یەکێك بە بێ رەوشتانەوە لێی نزیك ببوایەوە زۆر بە توندو رەقیەوە لە رووی هەڵدەگەرایەوە ، بەکورتی منداڵێکی خۆ راگرو رەوشت بەرز بووە .

کە بووە بە شاعیریش ، رەنگدانەوەی پەروەردەو خوی منداڵیەتی لە کەسایەتیدا رەنگی داوەتەوە ، بۆیە زۆر بە هەستی پاکو پڕ توانایی‌و هێزەوە لە نێوانی ئەو دوو ساڵانەی شەری یەکەمدا بەرەنگاری کرد .

لە پاشاندا دەهات ئەو توندو تیژییەی وورده وورده بەرەو نەمان بڕوات چونکە مەترسی سەنگەرەکان بە سام بوون سەیری دەکرد ئەو ناز و پەروەردە کردنەی لە خێزانەکەیەوە لێ ڕاهاتبوو لەگەڵ ئەم ترس و سوێرو تاڵیەی هەیە ، لە یەك دوورن تا خۆی پێ ڕابگیرێ .

وەکو گیان رزگار بوو ، بەڵام نەیتوانی بەرنگاری هەڵچوون و رق و تورەیی خۆی ببێتەوە، وە لە ئەنجامی شەڕدا تووشی بارێکی نا ئومێدی و هستیری بوو هەر وەکو خۆی دەڵێت ..

توانیویەتی بۆ ماوەی بیست ساڵ لە گەڵیا بژیت ، تا دوای ساڵەکانی دەیەمین ، وای بە سەر هاتبوو کە خۆی لە ئینگلترەوە دوور خاتەوە و ببێتە سوپەری خواوەندە سپیەکان و بگەڕێتەوە بۆ سەر شێوەی کلاسیکی ، کە زۆر بە گران و زەحمەتەوەش شیعرە راستگۆیەکانی لە بەر دەڕۆیی .

هەمان رووداو لەگەڵ ( جورج ئورویل ) رووی‌دا ، ئورویل هەستی بەم راستیەوە دەکرد کە وەکو پێویستیێکی سەر شانی ، خۆی پاك بکاتەوە ، چونکە لە سەرەتای بوونیەوە کە چاوی هەڵهێناوە خۆی لە ناو کۆشی چینێکی دەسەڵاتداردا بینیوە و بە ئەنقەستیش چاوی لە ناخۆشترین پلەکانی هەژاری و دژواری و نائومێدی پۆشیوە ، وە دەتوانین بڵێین تا رادەیەك بە لایەنی کەمەوە رووداوەکانی ( بۆرما ) ئوریلی گۆڕی و کەوتە ئەو قناعەتە کە ئەو ژیان و هەستو ڕەوشتەی لە ناو خێزان و دەورو بەرەکەی‌دا هەبووە هەموو درۆ و دەلەسەو ناڕاست بووە ، هەر چەندە ئەویش یەکێك بووە لە ناو ئەواندا ژیاوە .

**لە سەردەمی ئێمەدا ، تاکە نووسەری ئینگلیزی کە توانیبێ ڕوو بە ڕووی سەختترین هێز ببێتەوە و خۆی ڕاگرێ کە زۆر کاریگەر بوو ( د. هـ. لورنس ) بوو . زۆرترین ژیانییەش لورنس لە نێو چینی کرێکاراندا چاوی هەڵهێنا بوو ، لە دەرەوەی ئینگلترەدا بووە ، هیچ جۆرە پەیوەندیەکی ئەتۆی لەگەڵ چینی ناوەندی‌دا نەبووە کە پێوەیانی ببەستێتەوە ، بۆیە نووسیوویەتی و دەڵێت : (( لەو رۆژگاردا پیان دەووتم تۆ زانا و پسپۆری ، دەیانوویست ریزم بگرن لە بەر ئەوەی لەو دەستکەوتە گەورانەی ئەواندا هیچم لە دەستدا نەبوو )) ، وە ئەو هێزەی کە دەست نیشانم کرد لەو بەشانە دەژمێردرێن کە زۆر نائومێد و لە باری هستیری‌دا بوون لە بەر ئەوەی هەستیان بە تاوانێکەوە دەکرد . وە ئەو ڕووداوەی کە لە نیوە سەدەی دوایی‌دا ڕووی‌دا ئەوە بوو ، ئێمە وورده وورده هانمان دان بۆ ئەوەی هەست بە شت بکەن و بەرەو زیندوو بوونەوە بچن ، هەتا ئەوانەی کە لە ناو دوورگەدا ( جزيرة ) دەژیان و لا تەریك بوون و کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی هێزێکەوە کە هیچ پەیوەندییێکیان بە نەزاکەت و ریز و ئامۆژگاریەوە نەبوو .**

**لە پاشاندا زاناکانی ( لاهوت ) بە هێزی ( شەڕ ) ناویان نا ، وە زاناکانی ( دەروونی )یش بە ( لیبیدو ) وە ناویان دەبرد ، وە لە هەردوو بار و دۆخدا ، ئەو هێزە بە هێزی وێرانکاری و لەناوبردنی شارستانیەتی کۆنەوە دەژمێردرێت .**

لە ئاوێنەی ئەو هێزەدا ، رووگەی هەر دوو شەڕی جیهانی و ڕووی ئوردووگاکان و گیران و لە ناو بردنی جنسی ئادەمیزاد و هەتا شەری ( نەوەوی )یش کە چاومان لێ سور دەکاتەوە دەبینرێت .

لە نیشاندانی هەلوێستدا نامەوێ ناراست بم ، شەڕ و دژواری بیندراوە بەڵام شەڕەکانی ئێستای نوێ لەگەڵ پێشینی‌دا لە دوو جۆردا جیاوازیان هەیە ، یەکەمیان : شەڕێکی ( جماعي )یە و بە هاوڕێکی و لاتەریبیەوە ( متوازی ) گەورە دەبێت لەگەڵ گەورە بوونی کۆمەڵانی جەماوەردا ، لیرەدا شەڕەکانی ناوخۆیی نەژمێردراون ، بەڵام شەڕەکانی جیهانی بەیەکەوە زیان و وێرانکاری بە شارستانیەت و شەرکەرەکانەوە دەگەینێت کە جیاوازێکی تەواوی هەیە لەگەڵ پێشووی‌دا .

ئێمە سەیر دەکەین ئێستاکە لە شوێن ئەوەی ئازاردانی تاکەکان ، یان شێواندنی خوو ڕەوشت ، شارەکان بە تەواوی وێران دەکرێت ئوردووگای وا هەن بە هۆی زانستەوە هەڵدەسورێن وەکو ( کارگەکانی لە ناوبردن ) ، هەروەها هەرەس هێنان گەیشتووتە رادەیێ کە خۆ لێ گێل کردنی بە کارێکی گرانەوە دەوەستێت. ئینگلترە ئاسودە بوو ، بڕوای وا بوو کە شەڕە لە کیشوەرێ یان لە ئەو دوورتر لە وولاتێکی شاهنشاهیەتدا ڕوو دەدات و بە هۆی بەرنگار بوونەوەی سەربازەکانیان لە ناو دەبردرێت و کۆتایی بە کێشەکە دێت ، بەڵام ئێستا ئەگەر بڕوا بەوە بهێنین ، ئەوە پێویستیمان بە بیرکردنەوەیەکی تەسك و دوور لە هۆشی ئاسایی و دەبەنگیێ هەیە .

بەڵام کاری دووهەم : دەتوانین دەست نیشانی جیاوازیەکانی ئەو سەدەیە بکەین لە هەڵوێستماندا بەرامبەر بەو مەسەلەیە ، ئەو جیاوازیانەش قووڵ دەبنەوە لە : هەستکردن بە دژواری و سەختی کە بەرەو شەری ( جماعي ) هەنگاو دەنێ لە دەرەوەی خوددا ( ذات ) وە بە لا تەریبییەوە ( متوازي ) بەرە دەستێنێ لەگەڵ بۆ پێشەوە چوونو شیکردنەوەی نفسیدا ، واتە هەستکردن بەو هێزەی کە کار دەکاتو دووریشە لەوەی دەوری نوێنەرایەتی لە ناو دەروونی ئێمەدا ببینێ ، وە یەك لەو مەبەستە چارەسەریانەی کە بۆ تێبینییەکان کرا ، ئەو راستیەی بە دەرخست لەگەڵ تاقیکردنەوەدا لەو کاتانەی کە لە ئوردووگاکانی ( داخا و بوخنفولد )ی نازیەکاندا بەند بوو ، وە رۆشنبیریەتی خۆی بەوەوە دەوڵەمەند دەکرد لە رووی بە دیار خستنی ئەو جیاوازیانەی هەبوون لە نێوانی ئەم دوو ئوردووگایەدا ، لە چۆنیەتی شێوەی ئازاردانو پێکچوونی رووداوەکانیان ، هەروەها هەوڵی ئەوە دەدا کە ئەو رووداوانەی لە دەورو بەریدا رووی دەدا بەراوردیان بکا و بزانێ تا چەند لە دەروونی ئەویشدا روودەدات بەم جۆرەوەش دەری ببرێت .

وە بە رای یەکێك لەو شیکرەوە نەفسیانەدا، وا دەکەوتەوە :

ئەو شتانەی کە ئازاری پەناهەندەکانیدا تاکو لە ( ئەلمانیا ) دا رابکەن ئەوە بوو هەستیان بە تاوانێکەوە دەکرد ، هۆیەکەشی دەگەرێتەوە بۆ ئەو راستیەی قووڵتر دەبۆوەو هانیانی دەدا ، کاتێ نازیەکان بەهێزترین دڕندایەتیان لە ناو خودی ئەواندا نیشاندا کە هەڵسان بە کوشتنو لەناوبردنی دایكو باوكو براو خوشكو منداڵەکانیان ، وە راستیەکەشی هەر چۆنێك بوو بێت ، لە سەر ئێمەدا زۆر بە زەحمەت دەوەستێت کە لە سەدەیەکی شیکردنەوەی دەروونیا بژین ، ئەگەر چی لە هەمان کاتیشدا بتوانین خۆمان دوور خەینەوە لەو دڕندایەتیە گشتیانەی بلاو بۆتەوە هەر ئەوەش بوو ، کە دروستکەرو دەرهێنەری فلیمە بەسامو ترسناکەکان لە شاعیرەکانی ئینگلترەدا زیاتر هەستیان بە رارایی و نارەحەتی ( سەدە ) وە دەکرد .

لەبەر ئەوەی ئینگلترە ئوردووی گرتووخانەکانی بە خۆیەوە نەبینیبوو ، وەکو سوپەرێکی سەخت دژ بە زانیاری ( نفسی )یەوە وەستا بوو ، کاتێ ئەو هاندانە سەرەتاییانەی لێوە دەبینرێت ، شێوەی بەریتانی وەردەگرێت ، واتە شێوەی تاوانە جنسیەکانی ناوخۆیی ، وەختێ ئەو تاوانانە روودەدات ، بەختیاری هەموو لایەك دەگرێتەوە ، ئەگەر ( فرۆید ) لە شوێنێ ئەوەی کە لە ( ڤیێنا ) لە دایك بووە لە ( لەندەن ) لە دایك ببوایە ، زۆربەی خەڵك گومانیان وا بوو لە تاوان شووناسیەوە پسپۆری پەیدا دەکرد ئەوەك لە دەروون شووناسیەوە .

لەوەی کە بە بەر چاوتاندا تێپەڕ بوو ، من مەبەستم ئەوە نیە ، شیعری ئینگلیزی ئەو کاتە دەبێتە شیعرێکی نوێ ، ئەگەر هاتوو گرنگی بە لایەنی دەروون شووناسیو سوپاکاکانی گرتنو بۆمبای هیدرۆجین یان بە هەر چیەك لەو ئیسلوبە نوێیانەی توقاند بدات .

من نامەوێت هیچ شتێك بۆ شیعر دەست نیشان بکرێت ، چونکە ئەو شیعرەی کە بۆ بابەتەکان چارەسەری دیار دەکات لە پێشدا دان بە خۆیەوە دەنێت وەکو شیعر دەوەستێو دەبێتە پڕۆپاگندە .

مەبەستیشم نیە وا بەدیار بخەمو بڵێم پێویستە شیعر لەو خۆ بەدیار خستنەدا بوەستێ کە گوایە ژیان لە رەوتدایەو جگە لە چەند دوورە لایەنێکی کۆمەڵایەتی دیارکراودا نەبێت ژیان دەرواو دەروا هەر وەکو لە پێشیندا بە بێ گۆڕینکاری وا رۆیشتووە و ، پوختو بتەوەیو ریزلێنانو هەموو تەلیسمە پیرۆزەکانی کۆمەڵایەتی تریش بەردەوام دەبێت .

بە کورتی ئەوەی کە شیعر پێویستیەتی ، هەستی نوێو راستگۆیانەیە ، وە بە لای منەوە لە بەدیار خستنی ئەو راستیەدا ، رادەوەستێتە سەر پێز و توانا و هەوەسی شاعیر بەرامبەر بەو کۆمەڵە ئەزموونا نەی کە هەیەتیو خستنەکاری هەموو زیرەکایەتی خۆی لە چۆنیەتی بەرنگار بوونەوەیدا ، بەڵام لایەنی دەرباز بوونێکی ئاسان نەگرێت ، چ لە رووی نواندنی کاردانەوەی سلبی و لاسایی کردنەوەدا یان لە پەنجە خنکاوەکاندا بێتو خۆی بنوێنێ . ئەگەر برواتان بەوە هەبێت کە دەروون شووناسی جێ پەنجەی بە سەر شیعرەوە هەیە یاخود برواتان نەبێ ، خۆی بەم جۆرە وە دەنوێنێ .

**یەکەم : نوسەر دوای ئەوەی کە بە هیچ بڕوایەکەوە ناتوانێ ئینکاری بوونی مەترسیو ئارەزووەکانی خۆی بکات هەر چەندە حەز لە روو بە روو بوونەوەشی ناکات ، بەڵام دەزانێ لە**

ناخەوەیدا وەك تەمو مژێ هەیە ، هەر چەندیش لە شاردنەوەیدا هیز و کارامەیی بەکار بهێنێت ، لە کۆتاییدا هەر خۆی دەنوێنێ .

**دووەم : مادامەکی نووسەر دانی بە بوونی خۆیەوە نا ناتوانیپەنا بباتە بەر ئەوەی بە شیعر هەموو کارامە و زیرەکایەتی بخاتە گەڕ و بەکاری بهێنێ .**

لە وەختی هاتنی ( فرۆید )ەوە ، بەشی ڕۆمانسیەت لە نیوانی هۆش و سۆزدا وەکو سەردەم ( زمن ) دواکەوتوو بوو وە وای لێ هاتبوو بە جارێك بێ مانا بێت .

لەو بڕوایە دامە کە ت. س. ئەلیوت کاتێ ( وێرانە خاك )ی نووسینەوە شتێکی وای لە مێشکی خۆیدا هەڵگرتبوو ، وە ئەم هۆنراوەیە نەوەك جولانەوەی کۆمەلەکەی بەدیار دەخات کە لە دۆخێکی نالەبار بووە و بەس ، بەڵکو بە ووردەکاریەکی گەورەو لەگەڵ دەست نیشان کردندا جولانەوەی خود ( حركة الذات ) بەدیار دەخات .

قسە کردنو لێدوانی ئەلیوت لە بارەی کلاسیکیەتدا ، هەروەها بەکارهێنانی لە وێژەی ( لاهوت )یدا ، بە ئەنقەست بوو ، وە تیایدا سەرکەووتوو بوو لە رووی پەرەپێدانی موزوعیەت بۆ سەر بابەتی کەسایەتی لە شێوەیەکی قووڵو خەماویدا .

کەچی لە نێوانی کوتایی بیستەکانی ئەو سەدەیەدا وە لە سیەکانیشدا دەستکەوتە تکنیکیەکانی ئەلیوت دەستی پێکرد ، هەڵسا بە هەڵگێڕانەوە و هەڵسەنگاندنێکی بنەڕەتی لە کەلەپووری وێژەییدا ، کە شان بە شانی ئەو دەستکەوتانەش دەڕۆیشت و جێی چاوانو سەرسوڕمانی هەموو لایەك بوو ، بە جۆرێ هەتا پشتی لەو تجربە خودیانەی خۆی کرد کە زۆریش پیویست بوو لە کاتێکدا کە بۆ دەربڕینیان ئەو شێوە تکنیکە نوێیەی بەکار هێنا .

قوتابخانەی رەخنەی رەخساو درووست بوو ، مەبەستی سەرەکی لەوەدا بوو بە شێوەی تکنیکەوە بسەلێنێ کە پەیوەندیەکی چەسپاو یان هەتا گرنگیش لە نێوانی هونەر و درێژەپێدانی رەگو ریشالەکانی ناو ژیانی شاعیردا نیە .

لە چلەکانی ئەو سەدەیەدا ، لە کاتێکدا کە شیعری ئینگلیزی لە پێرەودا بووە ، کۆمەلە شاعیرێکی خوێن گەرمو نوێ لە ئەمەریکادا سەریان هەڵدا ، لە سەرووی هەموویانەوە ( روبرت لوویلو جۆن بیریمان ) بوو ، هەڵسان لە بارەی ئەلیوتو رەخنەگرەکانی سییەکانیان کۆلیەوە وە ڕای خۆیان وا نیشان دا کە پیویستە ئەو کەسەی ناوی شاعیر هەڵدەگرێت ( کارامەو زیرەکیو رەسەنایەتی بە هێز بێت ) بەڵام نەگەرانەوە سەر ئەوەی گرنگی بەوە بدەن کە ئەلیوت لە دژی رۆمانسیە پاشکەوتووەکاندا وەستاو بەرنگاریان بۆوە .

واتە رازی نەبوو بەو قوتابخانە ووشكو مەوزوعیانەی کە هەبوون هەر بۆیە خاوەنی ئەو هیز و توانایە بوون کە زۆر بە زیرەکیو کارامەیی شیعر بنووسنەوە ، وە لەگەڵ تەجربەکانیاندا نۆتە تیژرەوەکان بڕەخسێننو بە روونیو ئاشکرایەوە نیشانی بدەن ، هەر چەندە ئەو جورە تەجربانە هەندێ جار لە ئاست شیکردنەوە دا لە سەر ڕۆخی هەرەس هێنان بووە ، بۆ نموونە ئەو کتابەی دوایی رووبرت لوویل ( لێکولینەوەکانی ژیان ) لەم رووەوە هەنگاوێکی گەورە بوو لە بەرەو پێشەوە چونیدا ، رەنگە ئەو هۆنراوەیە : ( ترسنۆکی کویکرز لە نانتاکت ) دا کە لە هۆنراوە چاکەکانیدا دەژمێردرین لەوچامەیەدا نەبێت بەڵام دوا پەرتووکی لە هەموویانەوە بەهێزتر و ناودارتر بووە .

لە وەختێکدا کە ( لوویل ) هەولی ئەوەی دەدا لە بابەتەکانی دەرەوەی خۆیدا گیان بخاتە بەر تاقیکردنەوەکانی وەك - لاهوتیەك لە کاتۆلیکیەتدا ، دوانگەیەك لە لایەنی مۆسیقا و نۆتەکان و زمانەوانیدا ، وە بە بڕوای من ئیستا هەولی ئەوە دەدا کە بە هەموو راستگۆییو ئاراستە کردنێکەوە بە بێ پەناو پێچ چارەسەری تاقیکردنەوەکانی خۆی بکات .

بەڵام تەنیا راستگۆییو ئاراستەیی رووت و ئاشکرا لە رووی هونەریەوە دەستەبەر نیە بۆ وەدەست هێنانی دەستکەوتی پۆخت بەڵکو زۆر جار بە پێچەوانەوە روو دەدات ، زۆر کوپلەی ( لێکۆلینەوەکانی ژیان ) گرنگی بەو کارە شیکەرەوە دەروونیانە داوە زیاتر لەوەی کە تەرخان بوو بێت بۆ ئەوەی گرنگی بە شیعر بدات .

لەو وەختەی کە هەندێك لە شاعیرەکانی ( جولانەوە )دا بە ئەنقەست خۆیان دەخستە باڵ ئەوەی - هەستی بێگەرد لە هێمنیو بێدەنگیدا بەکاربهێنن ، بۆ ئەوەی رێگا بە

تاقی‌کردنەوەکانی خۆیان بدەن ـ کاتێ لە باشترین بار و دۆخدا دەبن ـ کە خود ( ذات ) بەهێز و تیژ و رژدە لە سەر بنیات نانی شیعردا .

ئەگەر بمانەوێ ئەو کارە زیندووانە بۆ شیعر بخوێندرێتەوە ، لێرەدا ئەو مەسەلەیە خۆی دەردەخات : ئایا لەم رووەوە شێوە رێگا بەوە دەدات بۆ هێنانە دی جورە سەرکەوتنێك ، رێگامان بدەن بۆ ئەوەی بەراوردێك بکەین : بۆ نموونە هۆنراوەی فیلیب لارکن ( لە سەر گژ و گیادا ) لەگەڵ هۆنراوەی تدهیوزدا ( خەونی وڵاخەکان ) .

**— لە سەر گژو گیادا —**

**بۆ چاو بە گرانەوە دەوەستێت وێنەکەی بکێشێت**
**لە ژێر ساردیدا بۆ داڵدەیێ دەگەڕێت**
**تاکو ( با ) هەڵدەکا و چڵو گەڵاکانی پەرشو بڵاو دەکاتەوە**
**ئەوسا یەکێکیان قەمپارێ لە گیا گیر دەکات و دەجوڵێتەوە**
**ـ وا پێ دەچێت دواییەکەیان بە ئاواتەوەیە ـ**
**دیسان جارێکی‌تر دەوەستێو بە بێدەنگی دەگەڕێتەوە**
**کەچی ئەوە پانزە ساڵ تێپەڕ بوو ،**
**رەنگە بیستو چوار ماوە ( مسافة ) بەس بێت**
**چونکە داستانێکی لێ دروست دەکەین :**
**تیشك لاوازە و ئابلوقە دراوە**
**لەو نێوانەدا ، گۆشتی برژاو و کوپەکان پێشکەش دەکەین**
**ساتمە لەو ئابلوقە دراوانە دەکەین ، کە ناوەکانیان بە گەورەیی**
**لە حوزیرانی کپ و کۆنینەدا دەدرەوشایەوە ،**
**لە سەرەتادا ، ئاسمان بە ئاوریشم دادەپۆشرێ**
**ژمارە و پاشماوەکانیش : لە دەرەوە دایە**
**ئۆتۆمبیلەکان بە بێ خەلك و بەتاڵو ئازادن**

گیایە وشکەو سەرقاڵە : لە پاشاندا هاوارێکی دوور و درێژ شۆڕ دەبێتەوە و درێژ دەبێتەوە ، هەتا هێمن دەبێتەوە لەو دارتێلەی لە شەقامدا کە هەر بۆ وەستان دروست بووە ..

**ئایا بیرەوەریەکانت وەکو مێشولەیێ گوێچکەت ئازار دەدەن .. ؟**
**سەر دەڵەقێنێو ئاونگ لە سەر گەڵاکان دەرژێتەوە**
**قەڵەبالغی و هاوار دەستی پێ‌کرد**
**هاوین بە دوای هاوین هەمووی هەر رۆیشت**
**گشتیان بەسەرچوو تەنیا گۆماوە دانشتووەکان نەبێ**
**ئەوانەی لە سەرنامەکاندا دانراون ، ناوەکانیان دەژێ**
**هەر خۆی ئەو ناوانەی داناوە ، بە راکشاویی دەوەستێت**
**بە هۆی ئەوەوە خۆشنودە گوایە وا دەژمێردرێت**
**نە چاویلکەیەکی دووربین دەتوانێ تا کۆتایی پێ بکات**
**نە ئەو لێکدانەوانەی کە شایەنی پێکەنینە بەرامبەر بە کاتژمێری دیار کراودا ،**
**مەیتەر و بەس ، منداڵیش مەیتەرە**
**لە ئێوارەدا جلەو دەگرێو دێن .**

— ئەو هۆنراوەیەی لارکن سووك و رەنگینە ، هەڵبەتە زۆر جوانە بەو شێوازە ناسکە تایبەتیەی ، خەمباری دەستی بە سەر داگرتووە هەوڵی داوە وەك ( ئەفلاتونی ) یەك ، یان راستر بڵێین لە سەر رێڕەوی گۆڤاری ـ النیورکر ـ وێنەیەکی ژیانی بەریتانی نیشان بدات ، کە لایەنێکی لادێیانە و لایەنێکی‌تریشی پەیوەندی بە وەرزشی پێشبڕکێی وڵاخەکانەوە هەیە ، وە چینە پێشکەوتووەکان بروایان وا بوو کە وڵاخەکان گیانلەبەری کۆمەڵایەتین بەو جۆرەی کە بڵاو ببۆوە لە رووی راکردنیاندا ، وە ئەو هۆنراوەیە هەڵچووە لە بەرەی جیهانی (R. S. P. C. A.) دەژمێردرێت ، وە کارامەیی زیاتر پێوە دیارە بەڵام گەرمایی لە هۆنراوەی ( خەونی وڵاخەکان )دا کەمترە .

**(( خەونی وڵاخەکان ))**

**کورەکانمان مەیتەری وڵاخەکانن**
**تا ئێستاش لە سەر پووشەڵانی ئاخوڕەکاندا دەخەوین**
**گشت کەلەپوورمان ماڵێنی پاشماوەی وڵاخەکانە**
**ئەوەی کە هەمانە و باسی لێوە بکەین ، نەخۆشی وڵاخەکانە**
**لەو شەوەی کە بۆ لای پشتی دەرگەوانی باڵەخانەدا درێژ دەبێتەوە**
**چاڵو چاڵ ، چاڵی وڵاخەکان لێ دەدرێ**
**وڵاخەکانمان قایشو گوریسەکانیان پساند ، چاوەکانیان لە**

**سپی بوون دایە ،**
**لە دەرەوەدا ماینەوە**
**مشك لە گیرفان و پووشیش لە ناو قژماندایە**
**لەگەڵ وولاخدا بەرەو نووتەکی بەسامو بروسکەی چاڵەکان**
**رووناکی فانۆسەکانیشمان بە رەنگێکی پرتەقالیەوە هەڵگیرساوە**
**دەمامکێکی بازنەیی لە رووەمانەوە دروست کردووە کە مەستی خەوە**
**لە خۆبووردن ، یاخود گیان وە بەرنانی وولاخەکان**
**هەتا گۆشەی چاوەکانمان بە دوای گیانێ وەبەرنانی دەنگەوەن**
**ئاوا بە ئاواتەی مردنین ، با وولاخەکانیش وورد و خاش کات**
**ئەگەر تلپەیەك خۆڵ بوو بە ئاسیا و نێوانمان**
**وا پێ دەچێت ئێمە نقوومی مەستی بوونیە بۆ خەو**
**ئەوەندەی گوێ راگرین ، بروسکەی وولاخەکـان کۆتە کۆتیانە**
**کە رۆژ بەدەرکەوت ، بەخەبەر هاتینەوە**
**لاشەکانمان رەق ببوو**
**هەر لە دەرگاوە بیابانێکی چۆڵ راکشـــاوە و بێ شوێنەوارە**
**بەرەو ( بەرد و دووپشك )وە**
**وولاخەکانیشمان لە ناو پووشەڵانەکانیاندا دەخەون**
**لە ئارەقەی ساحیرەکاندا نگووم دەبن ، تەمبەڵو هەژارن**
**لێمان گەڕێن ئێستا بەستراوەین**
**با لە نزیك ئەو وولاخە بەسەرزمانانەوە بین**
**ئەگەر ئاگری قیامەت وولاخێکی گەورە بێت**
**ئەبێ سوڕانی چاڵی وولاخەکان هەر خۆی بێت .**

بە گشــتی ئەو هۆنراوەیە بە پێوەری هیوز هۆنراوەیەکی چاك نیە ، ئەگەر بەراوردی بکەین لە گەڵ هۆنراوەکەی لارکن دەردەکەوێت دەســەڵاتی بە سەر کەمترە ژمارەیێ دەربڕینی نەخشێندراو و رۆمانسیانەی تیایە کە شێوەی خۆ نیشاندانی پێوە دیارە لەو دەربڕینە تقلیدیانەی ســـــەدەکانی ناوەندەدا کە بەرەو هــەڵخلیسکانی دەبات ، بەلام باسی شتێك دەکات کە ئەویش هەولێکی ئیجابیانەیە نیشـــانی داوە لــە رووی بنیاتناندا چونکە بــە راستگۆییو رەسەنانە بەهێزترین ئەندێشە دەردە بڕێت کە کۆمەڵێکە لەو هەڵچوونو هەســـتانەی خۆیدا ، بە پێچەوانەی وولاخەکانی ( لارکن ) . وولاخەکانی هیوز توند و تیژیو مەترسی ئامـادە کراوی تیایە ، لە نێوان درێژ پێدانێـکی دژواردا کاتێك کە دەیگێڕێتەوە ، بـــەم هــەمـــوو ترس بەخشینەی کـــە ژیـــان بەرەو گۆڕین دەبات بە زینـــدەیی هەر وەکو لە خەونا بێت ، زنجیرەیەك لەم ترسو هەستانەدا کە جیهانی ئاژەڵەو لە لای دەبێتە بەشێکی مادی ، گیانی وەبەر دەخات ، لە بەشـــــەکـــەی تریشدا دۆخێکە لە دۆخەکانی دەروون .

ئەو وولاخانە پێشینەیان لە ئەدەبدا هەیە ، دیارە وولاخی بەسام و سەیر ( ارسولا برانجون ) یان ترســـاندووە ، وەك لــە کۆتایی ( پــەلــکە زێڕینەکەی )دا پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکـــات ، لێرەوە نیشـــانەی فرەوانتر بەدیار دەکەوێت . دکتۆر لیفز وای دێتـــە بەر چـاو کـــە د. هـ. لورنس و ت.س. ئەلیوت دوو جەمـــــەر و نوێنەری ئەدەبی نوێنو لە زۆرانبازێکی بەردەوامن و شەڕ وەستاندیش لە نێوانیاندا نیە ، چاکترین نموونە شیعری نوێی ئینگلیزی جێ پەنجەی ئـەو دووانەی بە سەرەوەیە کە دەتوانن تێکەڵی یەکتری بکەنو بەرەو پێز و بتەو تری ببەن .

ئەوەی کە بۆ ئێمە دەستگیر بێت لە رووی رژد بوونی شعری نوێدا کە بە شیعری ( قووڵو نوێ )وە ناوی دەهێندرێت ، واتـە بـەر بەرەڵلا کردن بۆ تجربە و تیژبینی سیکولوجیەت و دەست لێ گیر بوونی ، کە لێرەدا د.هـ. لورنس دەکاتـە نیـوە بـــە تێکەڵاو بوونی لەگـــەڵ ووردەکاریو زیرەکایەتی ئەلیوت وەك ئەگەر ئەوەش رووی‌دا لە دوا جارە ئەو کارە نوێیانە دەخوێنینەوە کە لـە داواکاریەکەی کولیروجدا هاتووە واتە ( حالـەتی هەڵچوونی نەرمخـاو لەگەڵ سیستەمێکی زیاتر ئامادە کراودا ) تێکەڵاو بکرێت .

هـەستەکانی تایبەتیم وا دەڵێت ، ئێستاکە لە ئینگلترەدا لە رووی بەهرەی شیعردا زەخمێکی گـەورە هەیـە ، وە ئەو هەبوونەش شـــتێك دەهێنێتە ئارا ، بەلام ئەگەر پشت بە هیچ پیلانێکی وێژەییەوە نەبەستێت ، بەقەد ئەوەش پێویستـە شاعیرەکان لە دژی ئەو نەخۆشیانەی کە لە نـاو رۆشـــنبیری ئینگلیزیدا هـەیـە وەکـو بوون بەردەوامیش دووپات دەبێتەوە خۆیان بپارێزن ، واتە لە پەیرەوگەریەتیدا .

● **گۆڤاری ( الاقلام ) ژمارە (٦)ی ئادار ١٩٧٧**

# کێشەکانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردیو لێك دانەوەیەك

● **لە ژمارە ٧٣ یی گۆڤاری ڕوشنبیری نوێی خۆشەویستدا مامۆستا صباح غالب ووتایێکی بە ناوی ( لێکۆلینەوەیەك دەربارەی کێشەکانی ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی )یەوە بلاوکردەوەو لە سەرەتادا ئاگاداری ئەوەمان ئەکات کە ( ئەم نووسینە بەگژ هیچ کەسێکدا ناچێو لەڕوی چ کەسێکدا تیر ناخاتە کەوانەوە ) کە چی کەسی نەبواردوەو ووتارەکەی بەرەو ڕووی هەموو ڕەخنە گرەکانمان ئەکاتەوە ، وای ئەداتە قەڵەم کە ڕەخنەگری ساغمان نیە بۆیە ڕەخنەی کوردی توش چەندەها نەخۆشی بوەو نەخۆشیەکانیش لە شەش خاڵدا دەست نیشان ئەکات بێ ئەوەی ڕەچەتەی چارەسەری بێ بدات . بەڵام ئەوەی ئاشکراشە ووتارەکەی خۆش لە سەریەشەو ئاڵوزیو بێبینایی بەدەر نیە . وامنیش لێرەدا بەپێی تواناو بۆچونو لێکدانەوەی خۆم چەندێك لەوانە دەستنیشان ئەکەم . هیوادارم ووتارەکەی من هیچ نەخۆشیەکی نەبێتو خوێنەری خۆشەویست سودی لێوەربگرێت .**

● کاك صباح ئەڵێت : ئەگەریش بۆ هەر لێکۆلینەوەیەکی ڕەخنەیی تەنیا ڕێبازێك گیرایە بەر ئەوە بێشك ناتوانێ گشت لایەنە جۆر بە جۆرەکانی بەها ئەدەبیەکە دەربخات » لێرەدا نازانم مەبەستی لە ( تەنیا ڕێبازێك ) چیە . ڕاستە ئەبێ ڕەخنەگر مەوسوعەیەك بێتو شارەزایی هەمو ڕێبازە ئەدەبیەکان بێتو شارەزای چۆنیەتی دروستبونو سەرهەڵدانی بێت ، ئەوسا لە لێکۆلینەوەکەیدا بەپێی سەلماندنی بەجێو بەراورد کردنی بەرهەمە ئەدەبیەکە بداتە پاڵ یەکێ لەو ڕێبازانە . ئەوەش نارەوانیە بۆ ڕەخنەگر کە ئەگەر باوەڕی بە ڕێبازێکی دیاری کراو هەبو ئەوا باشو خراپی بەرهەمەکە بە پێی نزیکی یان دوری ئەو بەرهەمە لە باوەڕی خۆیەوە بڕیار ئەدات . با بڵێن ڕەخنەگر شارەزایی ئەو هەموو ڕێبازانە بوو بەڵام هێشتا مەرج نیە بتوانێ گشت لایەنە جۆر بە جۆرەکانی بەها ئەدەبیەکە دەربخات چونکە کە ووتمان لایەنەکان هەموو ئەمانە ئەگرێتەوە : شێوەو ناوەڕۆك . دەستوری زمان . ڕێنوس . لە شێوازیشدا زۆر لقی تری لێ ئەبێتەوە وەکو کلاسیو ڕۆمانتیکیو ڕیالیزمیو ... هتد . یان کە ووتمان ناوەڕۆك ئەویش زۆر لایەنی هەیە وەکو کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیو .... هتد کە وابو کە ڕەخنەگرێك هەموو ڕێبازە ئەدەبیەکان ئەگرێتەبەر مەرج نیە هێشتا هەمو لایە جۆر بە جۆرەکانی بەها ئەدەبیەکە دەربخات. چونکە کە ڕەخنەگرەکە ( بە نمونە ) لە شێوەو ناوەڕۆك ئەدوێتو لەو دوو ڕووەوە بەهاکەی دەرئەخات ، هەرچەندە مەرجەکە شارەزایی لە دەستوری زمانو ڕێنوسدا هەبێت بەڵام مەرج نیە ئەو شارەزاییە بۆ ئەوە بشێت کە وەکو پسپۆڕێك لەمانەش بدوێت بەڵکو ئەوەندەبێت کە خۆی نەکەوێتە ئەو هەڵانەوە بەسە . ئیتر ئەو بوارە نەگیراوە لە لایەن ئەوەوە کە لە شێوەو ناوەڕۆك دا ئیتر کەسێکی تر لە دەستوری زمانو بە ڕێنوس لەبەرهەمەکەدا ئەدوێ . پێچەوانەوە ئەگەر بەجێ بهێڵرێت بۆ شارەزایەك لەو ڕووەوە ئەوا چاکترە کەوابو ئەگەر دوو یا سێ ڕەخنەگر لە بەرهەمێك دووان ئەوجا هەموو لایەنە جۆر بە جۆرەکانی بەها ئەدەبیەکە دەرئەکەوێت . ئیتر ئەم بەها ئەدەبی دەرخستنە پەیوەندی چیە بە تەنها یەك ڕێباز یان هەموو ڕێبازەکانەوە ؟

کاك صباح ئەیەوێت یەك ڕەخنەگر هەموو لایەنە ئەدەبیە جۆر بە جۆرەکان شیبکاتەوە کەچی هەر لەم نووسینەی خۆیدا پەنای بردۆتە بەر ووتەیەکی نوسەرێکی تر کە لە ( مجلة عالم الفکر . المجلد التاسع . العدد الثاني . ل٦ ) وەریگرتوەو بۆ مەبەستێکی

تر هێناویەتیەوە . بەلام بێ ئەوەی بەخـۆی بزانێ کتومت بەرپەرچی ئەو ڕایـەی خۆی ئەداتەوە ووتەکەش ئەمەیە « لەگـەڵ ئەوەدا کە ڕەخنەگر هەولێکی زۆر لەبارەی سروشتی کارێکی ئەدەبی‌و ماهی‌یەتـەکـەیـەوە دەداو شی‌دەکاتەوەو لێ‌ی دەدوێ بەلام لـە گەلێك جـاراندا ناتوانێ هەمـو لایەنەکانی‌و نـاخی بکرێتـەوە ، کاری ئەدەبی کۆمەلەیەکی گران‌و بە یەکداچوی بیرو باوەڕو هەست‌و سۆزو تاقی‌کردنەوەی ئەدیبە ، ئەگـەر موستەحیل نەبێ ئێجگار دژوارە بکەینـــە هەموو بەش‌و ناوەڕۆکەکەی .... ) .

● هەر تەواوکەری ئەو چەند وشـــەیە کـــە وەری‌گرتوە ئەلێ : « ..... لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کـە سروشتی ڕەخنەی ئەدەبی زیاتر لە هونەرەوە نزیکە نەك لە زانستەوە » کاك صباح لەبەر گونجانی ئەم ڕایە لەگـەڵ ڕای خۆی‌دا پەنای بردۆتە بەری‌و بە نموونە هێناوێتیەوە هەروەکو لە تەعلیقی خۆشـیدا بۆ تەواوکەری ئەوقسـەیە ئەلێ : ( بۆیـــە خەتاو هەلەیەکی گەورەیە هێڵی راسـتو چەپ بەســـەر نموونەی ئەدەبی‌دا بێنین ) . لێرەدا مەبەستی من ئەو رستەیەیە کە ئەلێ ( سروشـــتی رەختەی ئەدەبی لە هونەرەوە نزیکە نەك لە زانســـتەوە ) هەر بەو هەقەش لێرەدا بەرەنگاری ئەبمەوەو لەســـــەر کاك صباحی حســـاب ئەکەم کەیەك ئەگرێتەوە لـەگـەلیـــاو بە نموونە هێنـاوێتیـەوە . **دەنا ئەگەر لێکۆلینەرەکەم ناڕاســـتەی ئەونوسەرەی گۆڤاری عالم الفكر بوایە جیـا ئەبو وە لێرەدا لێ‌ی نە ئەدوام . ئەوەی مـن بزانم هونەر لە هەرکارێکدا ئەوەیە کـــــە وردکاری‌و وردبینی‌و جوانی تیابێ هەروەها زانستیش ئەوەیە کەیاساو دەســـتورێکی تایبـــەتی خۆی هـەبێت‌و قـابیلی گۆڕان‌و گەشەکردن بێت‌و لەسەر بناغەیەکی سەلمێنراو مەوزوعی دروست بوبێت.رەخنەی ئەدەبیش وردکاری‌و وردبینی تیـایـەو ئەبێ پەیڕەوی ئیستاتیکا بکرێت‌و دەستورو یاسایەکی خۆی هەیەو قابیلی گۆڕان‌و گەشەکردنەو لەســـەر بناغەیەکی مەوزوعی ســـەلمێنراو دروستبوە کە جیاناکرێتەوە لە بنـاغــــە مەوزوعیەکانی بونی مرۆڤ‌و شارستانی بۆیە ڕەخنەی ئەدەبی هونەرەو لە هەمان کاتیشدا زانستەو ناتوانین بلێین لە هونەرەوە نزیکە نەك زانست .**

**کاك صباح ئەلێ « ئەمن بەش بە حالی خۆم لەگـــەڵ ئـەو ڕەخنـــە قالب بۆکـــراو و ( تەطبیقی ) یە وشکەدا نیم کە هەر لەسـەر زەوقی ڕەخنەگرو دەســـتوری دیاری کراو لەدایك ببێ ، پێشـــەکی بڕیاری ئەوە بدات ئەدەب دەبێ وابێ‌و وابنوســـــرێ » . من سەرانسەر بەپێچەوانەی ئەو ڕایەی کـــاك صەباحەوەم . بێ گومان مەبەستمان زەوق‌و هەلوێست‌و بۆ چونە. کەوابو هەلوێستەکەی چەوت بێت یان ڕاســـت ئەوە لێکدانەوەی ئەوەو بەس . خۆ ئەگەر بەزەوقی کەسێکی تر نوسی ئەی خۆی دەوری چی ئەبێت لـەو نوســــــــینەداو ئەو کارە بـۆ ئـەکات . بەلام ئەوەی ئێمە بەراستی ئەزانین ئەوەیـە کە رەخنەگر پێویستە زەوقی سەلیم بێت .** دەربڕینی مەوزوعی هەبێت‌و دور بێت لـــە پلار هاویشـــتنی کوێرانەو پێویســـتە بەو شێوەیە بێت کەلە خالی دووەمدا باســـمان کرد. بە نموونە پرسیارێك وەدەرئەکەوێت. ئایا ئەم وتارەی کاك صباح ئەگونجێ لەگـەل زەوقی من‌دا ؟ خۆ ئەگەر بگونجایە من لێرەدا بەرەنگاری نە ئەبومـــەوە . هـــەر چەندە هەردوکیشـــــمان لـــە ناوەنـدی ژیـانـە کۆمەلایەتیەکەوە بیرو ڕاو تاقی‌کردنەوەکانمان هەڵئەگۆزین بەلام ئەو بەشـــێوەیەك لێ‌ی تێ ئەگاو ســودی لێ‌وەرئەگرێت منیش بـە شـــێوەیـەکی‌تر . بۆیە هەریەکـەو بۆ ئەومەسەلانە چارە سـەرێکی جیامان لایـە . کەواتە بۆیە پێویســتی کرد زەوقیشمان جیـا بێت‌و هـەریەکـــەو بەپێ‌ی زەوقی خـــۆی بنوسێت ئەمەش ئەوەمان نیشان ئەدات کـە هەر ڕەخنەگرەو خاوەنی هەلوێســـــــتی خۆیـــەتی‌و پارێزگاری لێ ئەکات‌و ئەیەوێت بیسەپێنێ‌و لـەو ڕوانگەیەشـەوە ئەڕوانێتە هـــەر هەولێك و ئەوەشـــە ( زەوق ) پێك ئەهێنێ .

پاش ئەوە کاك صباح ئەلێ کە لەگەل ئـەو رەخنە قالب بۆکراوەدا نیە پێشەکی بڕیاری ئەوە بدرێ کە ئەبێ بەرهـــەمـــە ئەدەبیەکان وابنوسرێ . بەلام من ئەلێم پێویستە ئـەو ڕەخنە قالب‌بۆکراوە بڕیارە هەبێت ئەگـــەر ڕەخنەگرو نوسەرەکە لەســــــەر یەك لای مەسـەلە دژبەیەکان وەســــتابون چونکە لەوکاتەدا ڕەخنەگر پێشرەوایەتی نوسەرەکە ئەکات بەســـــفەتێکی لەو شارەزاترەو ڕێ‌و

شوێنی ڕاستی بۆ دائەنێ تاکو پرۆگرامەکەی نوسەر سەرکەوتو بێتو دەوری کاریگەری خۆی ببینێو ڕەخنەگر لەم کاتەدا بەنسبەت نوسەرەوە وەکو ( واعظ )ێك وایە . بەڵام منیش وەکو کاك صباح ئەڵێم ناگونجێ ڕەخنەگر قالبو سنوور بۆ نوسەر دابنێ ئەگەر هەریەکەیان لەسەر لایەکی دژبەیەکی مەسەلەکان وەستابون بۆیە ئەو ڕایەی کاك صباح هەر لەم حاڵەتەدا ڕاستە چونکە لەم حاڵەتەدا بەتایبەتی لە ڕوی بیرو چارەسەری مەسەلەکانەوە دژبەیەکنو نوسەر هەر مەرجیش نیە گوێ بۆ ڕەخنەگرەکە رابگرێ بەڵکو نوسەر بە بەرهەمەکەیو ڕەخنەگر بە ڕەخنەکانی صراعێکی بیرو باوەر پێك‌ئەهێننو پێك‌هەڵپرژان دروست‌ئەبێت .

● **کاك صباح ئەڵێ : « حوکمی ڕەخنەیی دەربارەی تێکستێکی ئەدەبی بڕیارێکی سەد دەرسەد تەواو ڕاستو مەقبول نیە لای کۆمەڵ .... کەواتە هەر حوکمێك کە هەر ڕەخنەگرێك دەیدا بڕیارێکی تەقریبیو نیسبەتێکی ڕاستی تێدایە »* بەڵام من ئەمەوێ لە کاك صباح بپرسم کام کۆمەڵ ؟ کۆمەڵێك کە لە چەند چینێکی جیاوازو چەندین بیروڕای جیاو خاوەن هەڵوێستی**

* ئەو وتەیەی ناوکەوانەکە کاك صباح لە نوسەرێکی‌کەی وەرگرتووە بەپێی ئیشارەت پێدانی خۆی بەڵام دیارە لەگەڵ بیروڕای‌دا ئەگونجێ بۆیە بە نموونە هێناویەتیەوە .

جیا پێك‌هاتوە کەچی ئەم وەکو ( کتلە )یەکی لێك‌نەپچراوی وەکو یەك لە هەموو ڕویەکەوە مامەڵەی ئەکاتو بیروڕای ئەو ( کتلە )یە وەرئەگرێ بۆسەر ڕەخنەیەکی ئەدەبی . بێ‌گومان هەر ڕەخنەیەکی ئەدەبی بەڵکو بەرهەمەکەش لەبەرژەوەندی پارچەیەك لەو کۆمەڵە ئەبێتو لەسەداسەد بە دڵی ئەو پارچەیە ببێت یان نەبێت ئەوە ئەکرێت بە قیاس . بێگومان لەو کۆمەڵە فرە بەشەدا مادەم لەبەرژەوەندی بەشێکیان بوبێ سێو دوو دژ بە بەرژەوەندی پارچەیەك یان چەند پارچەیەکی تریان ئەبێت . ئیتر چ پێویستمان بەوە هەیە کە ڕەخنەگر ڕەخنەکەی سەد دەرسەر لای کۆمەڵ مەقبول بێت . کەوابو مەقبول یان نامەقبول لای کۆمەڵەوە

( بەگشتی ) ئەوە ناگەیەنێ کە بڕیارێکی تەقریبی نەبێتو نسبەتێکی ڕاستی تێدایە . ئەشێ بڕیاری ڕەخنەگرێك نەك نسبەتێك بەڵکو تەواوی ڕاستیش تیدابێت بەڵام ئەو ڕاستیە بەپێی جیاوازی ئایدۆلوژیو جیاوازی بەرژەوەند لای هەندێکی تر چەوتە بۆ نموونە زێدەبایی ( فائض القیمە ) بەپێی لێك‌دانەوەی خاوەن تیورەکانی سەر بە ئایدۆلوژیای چینی کرێکار ڕاستیەکی تەواوە کە بەرهەمی ڕەنجی شانی ئەوانە ئەچێتە گیرفانی سەرمایەدارەوە بەڵام لەلای سەرمایەدار ڕاست‌نیەو ئەوە بەڕاست ئەزانێ کە خستنە گەڕی دەستمایە ئەو پارەیە پەیدا ئەکاو مافی حەڵاڵو زوڵاڵی خۆیەتی .

کاك صباح ئەڵێ : « ئەدەب ئامانجە بۆ زیاتر تێگەشتن لە مرۆڤو لەگەردون بەڵام ڕەخنەی ئەدەبی مەبەست نیە بەڵکو هۆیە » بەڕای من ئەگەر ئەدەب ڕەنگ‌دانەوەی ڕووداوەکانو واقع بێت ئەوا واقعو روداوەکان هەموو ( وەسیلە )ن بۆ زیاتر تێ‌گەشتن لە مرۆڤو لەگەردونو هەموو نهێنیەکانی ، کەواتە ئەدەبەکەش هەمان شت ( وەسیلەیە ) نەك ئامانج . خۆ ئەگەر ئەدەب شی‌کردنەوەو باس‌کردنو فێرکاریش بێت ئەوا هەر هەمان شت . ڕەخنەش کە زیاتر شی‌کردنەوەو ڕوون‌کردنەوەو ساغ‌کردنەوەی ئەدەبەکە بێت کەواتە ئەمیش پاڵپێوەنەرێکی ئەو مەبەستە ( وسیلە )یە یە .

کاك صباح ئەڵێ : « ئەو زاراوانەی کە لە ڕەخنەی کوردی‌دا بەنەکاملیو بێ‌وەختی ناویان دێ‌زۆرن » نموونەش بۆ ئەمە فروێدی ئەدەبی نا ماقوڵو فۆتوگرافیو سروشتیو سریالی و دادائیو ریالیزمو ... هتد ئەوەی بنەما مێژوویەکانی ئەدەبو ڕەخنەی ئەدەبی بزانێ بێگومان ئەوەش ئەزانێ کە ئەدەب سەر هەڵئەدات . ڕەخنەش لە دوایاو ئەدەبەکە چونیەتیو ئاستی ڕەخنەکە دیاری ئەکات . باشە ئەگەر ئەو زاراوانە کە ئەو لە

ڕەخنەدا بەناوەختیان ئەزانێت بەڵام لە ئەدەبەکەدا پێشتر هاتبن ئەبێ کاك صباح لەو قسەیەی پاشگەز نەبێتەوە ؟ ڕەخنەگرو رەخنە بۆ تاوانبار بکرێن ، ئەگەر ئەدەبێك ( بە نموونە ) بەتەواوی رەنگدانەوەی ڕێبازە دەرونیەکانی فروێد بێت ، کە رەخنەگریەت و لەو بەرهەمە ئەدوێت ئەوا ناچارە باس ئەو ڕێبازە بکات و ناوی بهێنێ و بە بەراوردو سەلماندن بەرهەمەکە بداتە پاڵ ئەو ڕێبازە . ئیتر بۆچی ئەو زاراوانە لە ڕەخنەی کوردیدا ناوەختن ؟

- **کاك صباح ئەڵێ : « ئێمەی کورد لە چەند کەسێك زیاتر لەوچەشنە ڕەخنەگرانەمان نی‌یە کەچی لە ڕەخنەی ڕۆژانەی سەر لاپەڕەکاندا دەیان ناو بە ناوی ڕەخنەگرەوە نووسین بلاودەکەنەوە بێ‌گومان ئەوانە هیچیان هەل‌ومەرجی پسپۆریان لەکرداری رەخنەیی‌دا نیە بۆ ئەوە ناشێن خۆیان لە ئیشی خەلکی دیکە هەڵقورتێنن » دەبێ بەپێی ڕای کاك صباح مەرجی پسپوری لە کرداری رەخنەیی‌دا چ بێت ؟ هەر خوانەخواستە بروانامە ( شهادة ) نەبێت قەیناکە ! خۆ ئەگەر کامڵی و شارەزایی تەواوی هەموو لایەنە کۆمەلایەتی و ئەدەبی و ئابوری و سیاسی و ... هتدیێت ئەبو ئەم نووسینەی کاك صباح بواری بلاوکردنەوەی پێ‌نەدرایە . ئەوساش کەبۆی بلاونەکرایەتەوە گلەیی لە ڕۆژنامەکان ئەکرد . کەوابو هەر نوسەرێکی‌تریش وەکو خۆی سەیر بکات و رێز لە بیروڕای سەربەست بگرێت . خۆ ئەو کەسانەی کە ئەو ئەڵێت رەخنەیان ئەبینێ و رەخنەگرنن ڕەنگە هەر تەنها بەرەنگاری نوسینێك یان نوسەرێك بووبن کەچی ئەم‌خۆی بە نوسەرەکانەوە ئەوەستاوەو بەرەنگاری هەموو ڕەخنەگرەکان بوە. خەلکی شتی مەوزوعی ئەوێت و رۆژنامەکانیش ئەبێ هەر بەو چاوە سەیری رەخنەو بەرهەمی ئەدەبی بکەن ئیتر رەخنەگرەکە هەر هەرکەس بێت .**

- هەروەکو لە خالی حەوت‌دا باسمان کرد کاك صباح داوای ئەوە ئەکات کە بواری ئەوکەسە نا پسپۆرانە نەدرێ کە خۆ لەکاری خەلکی هەڵئەقورتێنن و نوسین بلاونەکەنەوە بەلام ئەبینن لێرەدا ئەڵێ « پراکتیك و مەشق کردن لەسەر رەخنەو تاقی‌کردنەوە لەو بوارەدا زیاتر ڕەخنەگری گەورەو لێ‌هاتو دروست ئەکات » ئەی کاکی‌برا تۆ ئەگەر بواری رۆژنامەکانیان لێ بگری و رێگەیان نەدەی خۆ لە ئیشی خەلکی هەڵقورتێنن و قسەکانت ئەوەی پێوەدیاربێت کەداوا لە رۆژنامەکان بکەیت کە نوسینەکانیان بلاونەکەنەوە ئیتر پێم نالێی ڕێ و شوێنی ئەو مەشق‌کردنە لەسەر رەخنەگرتن و تاقی‌کردنەوە کوێیەو چۆن ڕەخنەگری گەورەو لێ‌هاتویان لێ‌دروست ببێ ؟

کاك صباح گلەیی ئەوە ئەکات کە دوو بەرەکی نێوان نوسەران و ڕەخنەگران بۆتە هۆی دابەش کردنی خوێنەرانیش بە چەند بەرەیەکەوەو ئەمەی کردۆتە نەخۆشی شەشەمی ڕەخنەی کوردی لە ووتارەکەی‌دا . بەلام من بە کاك صباح ئەڵێم کۆمەڵی ئێمە کە شەریحەی چینایەتی جیا جیای تیایەو هەروەها دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی و گەلێ شتی تریش هەڵوێست و بیروڕای جیا جیا هەیەو ئەمەش شتێکی حەتمی و مێژوویەو دیاردەیەکی ئاسایە چ بەنسبەت کۆمەڵی ئێمەوە یان هەر کۆمەڵێکی وەکو ئێمە لە دەرەوەی وڵاتیش کەوابو مەسەلە ئەدەبی و لایەنگرتنەکانیش لە لایەن خەلکیەوە بەپێی ئەو بیروڕا جیا جیایانە دیاردەیەکی مێژویی و ئاسایەو نوسەرو رەخنەگر هەرکەسەو هەقی خۆیەتی کە بیرو ڕایەك بەپێی بەرژەوەندی خۆی ( بەرژەوەندی تایبەتی نا ) هەڵبژێرێ و خوێنەریش هەقی خۆیەتی ئەم یان ئەویان پەسەند بکاو ئەم یان ئەویان ڕەت بکاتەوە . لە کۆتاییدا ئەڵێم کە کاك صباح وەك پسپورێکی شارەزاتر لە ڕەخنەگرەکانمان ( بەلای خۆیەوە ) ئەم وتارەی بۆ ڕەخنەگرەکانمان نوسی بوو نەئەبو ئاوا رووکەش ( سطحی ) بێت پڕبێت لەو هەمو ناتەواویە . ئیتر هیوادارم سودێکم گەیاندبێت بە ووشەو ئەدەبی کوردی و خوێنەری خۆشەویست .

* * *




لە ژمارە « ٨٠ »ی گۆڤاری «رۆشنبیری» دا لـەژێـر نـاوی ( دوای ئـەوەی « ژان »م خوێندەوە )دا کاك موعتەسەم سالەیی نووسینێکی بلاوکردبووەوە . منیش دوای ئەوەی نووسینەکەم خوێندەوە ، بە پێویستم زانی ئەو هەلانە دەستنیشان بکەم کە کاك موعتەسەم تێ‌ی کەوتووە . دیارە ئـەوەی لێرەدا باسی‌دەکەم باری سەرنجی خۆمە سەبارەت بەنووسینەکەوە ، بەلام ئەگەر بۆم لوا ئەوا لە دەرفەتێکی تردا بەدرێژی باسی شانۆگەری‌یەکە دەکەم ( کە لە نووسینی فەهمی کاکەیی )یە تێکڕای نووسینەکە ناکرێ ناوی رەخنەی لێ‌بنرێ ، چونکە سەرجەمی ئەو رستانەی کە پەیوەندی‌ی بە شانۆگەری‌یەکەوە هەیە لە بیست رستە زیاتر ناترازێ ، ئەمە لەلایەکو لەلایەکی تریشەوە ئەوی بەدی ناکرێ لە نووسینەکەدا « اسلوب »ی رەخنەیە ، مەبەستیشم لە نەبوونی ئەم « اسلوب »ە لای نووسەر نەبوونی پرۆگرامو رێڕەوی رەخنەگرانەیە ، ئەمەش لەو پەل‌وپۆ هاوێشتنانەدا بەدی دەکرێ کە کاك موعتەسەم کردوویەتی ، بۆیە دەبینین بەدرێژایی باسەکە رێچکە رێ‌ی لابەلا دەگرێتەبەرو لەئەسلی بابەتەکە دەرئەچێ‌و هیچ شتێك بەدەستەوە نادات .

وەکو شتێکی بنەڕەتی‌ی دەتوانین ئەو هێلانەی کە لە رەخنەی دەقێکی شانۆیی‌دا بەکار دەهێنرێ لێرەدا دەستنیشانیان بکەین :

**١ ـ هەیکەلی درامی**
**٢ ـ بینای درامی**
**٣ ـ حبکە**
**٤ ـ کارەکتەرەکان**
**٥ ـ بابەت**
**٦ ـ حوار**
**٧ ـ کات‌وشوێن .**

هەر رێبازێکی رەخنەگرانە باسی کام شانۆگەری بکات ، دەبێ لە دەلاقەی ئەم لایەنانەوە چەپکەتیشك ئاراستەی بابەتەکە



ـكات .. دەنا وەکی‌تر قسەی لاوەکی‌و دوور لە بابەتەکە ناوی رەخنەی لێ‌نانرێ ، هەڵبەتە کاك موعتەسەم باسی هەندێ لەم لایەنانەی زۆر بەکورتی کردووە .. بەڵام چۆن ؟ .. باسەکەی سەبارەت بەم لایەنانە لەسنووری ناونیشان‌و ناوهێنانی سەرپێ‌ی زیاتر هیچ شی‌کردنەوەو کەشف‌و بە ئەنجام گەیشتنی تێدا نی‌یە .. بۆ نموونە باسی زەمان‌و کات ئەکات‌و ئەڵێ : « کاتی شانۆگەری‌یەکە شەوو رۆژێکە » ، ئیتر موناقەشەی مەسەلەی زەمانی شانۆگەری‌یەکە ناکات . کەسێ شانۆگەری‌یەکەی خوێندبێتەوە زۆر بە ئاسانی‌و بێ ئەوەی بیریشی لێ‌بکاتەوە دەزانێ کاتی شانۆگەری‌یەکە شەوو رۆژێکە . ئێ ئیتر چی ؟ ئەو هەڵەیەی کاك موعتەسەم سەبارەت بەمەسەلەی زەمان‌و کاتی شانۆگەری‌یەکە تێ‌ی کەوتووە ئەوەیە کە نەیتوانیوە لەوە بکۆڵێتەوە کە ئایا زەنجیرەی ئەو زەمانە لە خزمەتی بابەتەکەیە یا نەء ..

پرسیارەکانیش ئەمانەن : ئایا زەنجیرەی ئەو زەمان‌و کاتانە لەگەڵ بینای درامی کارەکتەرو رووداوەکان هاوتەریب دەڕوات ؟ .. ئایا دەکرێ فلانە دیمەن لابرێ‌و یا لەگەڵ دیمەنێکی تردا بەیەکەوە ببەسترێت ؟ ئەم دوو پرسیارە لەم مەسەلەیەدا بەنیسبەت رەخنەگرەوە دەبێ جێگایەکی چاکی هەبێ بەڵام جەمسەری باسەکە هەرگیز باسی کاتی شانۆگەری‌یەکەی نەکردووە . لە ئاستی مەسەلەی جێگاو شوێنیشدا کەوتووە نێو هەمان هەڵەوە . مەبەستم لێرەدا هەڵەی لەکۆڵ‌کردنەوەیە بە یەك رستەی خشت‌و هیچی‌تر.. دەڵێ:« رووداوەکان لە کۆلانێکی پێش نەکەوتوودا رووئەدات ، دیارە مەبەستی لێرەدا کۆلانێکی میللی‌یە « شعبي » ، کە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کۆلانێکی میللی پێش نەکەوتوو بێ .

هەڵەکانی نووسەر سەبارەت بە کارەکتەرەکان زۆر بێ‌شومارن ، چونکە لە بناغەی شی‌کردنەوەی کارەکتەر ئاگادار نەبووە . لە شی‌کردنەوەی هەر شانۆگەری‌یەکدا کە باس دێتە سەرباسی کەسانی چیرۆکەکە لە رووی کۆمەڵایەتی‌و سروشتی‌و سایکۆلۆژی‌یەوە ئەو کەسانە شی‌دەکرێنەوە . گەورەترین لایەن لەباسی کارەکتەردا مەسەلەی پاڵ‌پێوەنەرەکانە « الدوافع » ، ئایا هەڵس‌وکەوت‌و بیرکردنەوەی کارەکتەرەکان لەگەڵ ئەو شتانەی کە هانیان دەداو پاڵیان پێوەدەنێ دەگونجێ ؟ ئایا لەو کەسەدا پاڵ‌پێوەنەری سەرەکی هەیەو کامەیە ؟ ئەمجاشان بەشان ئەو شتە سەرەکی‌یە پاڵ‌پێوەنەری دیکەی هەیە ؟ ئایا نووسەر توانیویەتی « تبرير » بۆ دانانی ئەم پاڵ‌پێوەنەرانە لای ئەو کەسە بدۆزێتەوە ؟ ئەمجا جۆری کارەکتەرەکە سادەیە یا ئاڵۆزە ؟ رووکارە یا قووڵە ؟ ئایا تەرکیبی ئەو کارەکتەرە تا چ رادەیەك خزمەتی رووداوو حبکەی شانۆگەری‌یەکە ئەکات ؟ ئەم هەموو پرسیارانە لەلایەك بەڵام پرسیارێکی تریش لەلایەکی‌ترەوە .. سەردەرئەکا کە ئایا نووسەر چەند توانیویەتی « تكنيك »ی شانۆگەری‌یەکە لە پێناوی کارەکتەرەکاندا بڕەخسێنێ .. نووسەری باسەکە بەلای یەکێ لەم پرسیارانەدا نەچووە ، کە قەت مومکین نی‌یە کەسێ پەلەقاژەی رەخنەگەری بکات‌و ئەم پرسیارانەش بەشتی لاوەکی بزانێ‌و یانیش بە بای گوێ‌یدا نەدات .. تەنیا ئەوەندە دەڵێ : « کارەکتەرەکان باش نەخشەیان بۆ کێشراوە .. کاڵا بەقەد باڵا » .. کاڵا بەقەد باڵا یەعنی چی ؟.. ئەمە لە رەخنەدا نایخوات !! .

ئەوەی نووسەر هەندێ بایەخی پێ دابێ تەنیا لایەنی کۆمەڵایەتی کەسانی چیرۆکەکەیە ، ئەمیش هەروەکو دەستنیشان‌کردنی ئیش‌وکاری رۆژانەیانەو هیچی تر دەڵێ :

« قالە » باوکەو قومارباشیشەو عارەق خۆریشە » ..

« حەمە سالح گۆشت برژێنەو ئاین پەروەریشەو رێزلێ‌گرێکی نەریتی باووکۆن خۆی دەنوێنێ » . نووسەر تەنانەت لەم لایەنە کۆمەڵایەتی‌یەشدا هەڵەی عەنتیکەی کردووە .

ووشەی قومارباشی نازناوی قالەیە ، بەڵام ئەم بەم نازناوەوە لکاوەو یەك دونیا باسی قومارو

مێزی سەوزی کردووە ، وای لە قەڵەمداوە کە دەبێ قالە کەڵە قومارچی بێ ، ئەمە تەنیا لەبەر ئەو نازناوەو هیچی تر ، خۆ ئەگەر کاك موعتەسەم ئەوەندەی مەشغوولی ئەو نازناوە بووە ئەوەندە شانۆگەرییەکەی شیبکردایەتەوە دەگەیشتە ئەو بڕوایەی کە لە شانۆگەرییەکەدا تەنیا یەك بەڵگە نییە ئەوە بسەلمێنێ قالە قومارچییە .. لەبەشی دووەمی شانۆگەرییەکەداو لەم گفتوگۆیەی نێوان حەمە سالحو نەسریندا دەرئەکەوێ کە قوماربازی تەنیا نازناوی قالەیەو هیچی تر :

**حەمە سالح : ئەوە بۆ بە باوکت ئەڵێن قالە قوماربازی ؟**

**نەسرین : کێ ئەڵێ ؟**

**حەمە سالح : خۆی ووتی .**

**نەسرین : تەنها خۆی بەخۆی وا ئەڵێ .. ئەگینا باوکم قومار ناکات .**

سەبارەت بە حەمە سالحیش دیسانەوە نووسەر بە هەڵە لە کارەکتەرەکە گەیشتووە چونکە وای داناوە کە حەمە سالح گۆشت برژێنەو ئایین پەروەریشە لە کاتێکدا کە حەمە سالح بێئیشەو بەدرۆ پێیان دەڵێ کە من گۆشت برژێنم ، ئەمەش لەوەدا دەرئەکەوێ کە سبەینێ ناچێتە سەرئیشو خۆی لەماڵەوە خەریك دەکات . بەهەمان شێوە حەمە سالح بەدرۆ خۆی وەکو ئاین پەروەرێك پیشاندەدات تا وەکو زیاتر جێگای بڕواو متمانەی ئەوان بێت . بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە حەمە سالح بەقالە دەڵێ کە سبەینێ زوو بۆ نوێژی بەیانی هەڵیستێنێ ، بەڵام ئەم کە قالە بەخەبەری دێنێتەوە هەڵناستێت :

**نەسرین : باوکم بەیانی زوو زۆر بانگی کردی .. بەڵام بەخەبەر نەهاتیت .**

**نووسەر بەهیچ جۆرێ باسی تەرکیبی دراماتیکی شونۆگەرییەکەی نەکردووە . کە باسی بابەتی شانۆگەرییەکەیش دەکا تەنیا ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە بێئەوەی باسی شتە سەرەکییەکان بکات .. وەکو : حبکە ـ کرداری سەرەکیو بەرزبوونەوەی هێڵی درامیو لووتکەو شۆڕبوونەوەی کرداری درامی .**

ئەمجا پێوەندی هەموو ئەمانە بە بیری سەرەکیو زمانو حواری شانۆگەرییەکە بخاتەروو . جگە لەوەی کە بەراوردی سەیر سەیر دروستدەکا بە زۆرەملێ ئەیخزێنێتە ناو بابەتەکەوە ، بۆ نموونە : کە بەراوردی دالدەدانی ماڵی قالە بە پەیمانەکەی نێوان شەیتانو ڤاوست دەکات . نووسەر لەم بەراوردکردنەدا بەتەواوەتی لە بابەتەکە دەرئەچێ .. چونکە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان ئەم دوو نموونەیەدا نییە . دالدەدانی ماڵی قالە لەلایەن حەمە سالحەوە بە نیسبەت قالەوە هەرگیز پەنابردنی پێناوترێ ، چونکە حەمە سالح خۆی تەکلیفێکی زۆریان لێئەکاو بەدەستی خۆی جلکەکانیان ئەباتە ژوورەوەو بە بێ ئەوەی هیچ مەرجو سنوورێکیشیان بۆ دابنێ .. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە مەبەستی قالە ئەوەیە تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت لە ماڵی حەمە سالحدا بمێنێتەوە تاوەکو چارەسەرێکی وەزعی خۆی دەکات ، ئەمە و سەرەڕای ئەوەی کە قالەی بەستە زمان لە نیازی حەمە سالح ناگات .. بەڵام ڤاوست گەیشتووەتە رادەیەك لە هۆشمەندیو بیرکردنەوە سەبارەت بەرزگارکردنی روحی ئادەمیزاد لەگەڵ شەیتاندا ئەکەوێتە کێشەوە ، من نامەوێ لەسەر ئەم بابەتە بڕۆم بەڵام ئەوەندە دەڵێم سازکردنی بەراوردێکی ئاوا لە نێوان ئەم دوو نموونە زۆر لەیەك دوورەدا خەیاڵێکی بەپیتو بە بەرەکەتی ئەوێ .

سەبارەت بە بابەتەکەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی لەو قاڵبە هونەرییەدا .. نووسەر هەندێ شتی بەجۆرێ تەفسیر کردووە کە ئەگەر بیکردایەو نەیکردایە هەر هیچی نەئەگەیاند ، وەکو ئەوەی کە دەڵێ : « عەزەو حەمە سالح وەك دووکەسی سەر بەچینی بۆرژوای ناوەندی هەست بە بەرژەوەندی یەکتر دەکەنو دەستی هاتنو ڕێککەوتن بۆ یەکتر درێژ دەکەنو بۆ ماوەیەکی کەم ناکۆکییەکانی نێوان خۆیان لە نێو دەبەن » نووسەر کە دەستنیشانی ئەوە دەکا

کە ئەم دووانە سەر بە چ چینێکن هیچ شتێك بەدەستەوە نادات ، چونکە جۆری کێشەکە پێوەندی‌ی بە شناسنامەی چینایەتی ئەم دووانەوە نی‌یە .. ئایا کێشەکەیان وەکو دوو بۆرژوای ناوەندی لەگەڵ کێ‌دایە ؟ ئەگەر بڵێین کێشەی چینی بۆرژوا لەگەڵ چینی کرێکاردایە خۆ ئەوە قالەش پۆلیسی تەقاویتە .. هیچ کێشەیەکی چینایەتی لەگەڵ ئەم دووانەدا نی‌یە . ئیتر نازانم نووسەر کە ئەم ئیشارەتەی‌دا ویستی بڵێ چی !؟

لە شانۆگەری « ژان » دا بە هیچ جۆرێك کۆرس بەدی ناکرێت ، ئەوەی هەیە کۆمەڵە دەنگێکە لەو دیوی کالوسەکانەوە ئەبیسترێ .. بەڵام وەکو کۆمەڵێ کەس بێنە سەرشانۆو مەیدانێکی دیاری‌کراو لە رووداوەکانداو لەسەر تەختەی شانۆکەدا داگیر بکەن ، ئەمە لە شانۆگەری « ژان » دا بەدی ناکرێ مەسەلەکەش زۆر روون‌وئاشکرایەو پێویستی بە وورد بوونەوە نی‌یە .. ئیتر نازانم نووسەری باسەکە ئەم مەسەلەی کۆرسەی لە کوێوەو چۆن پەیداکرد . نەك هەر ئەوەندە بگرە بەبێ‌سوود باسێکی دوورو درێژی کۆرس لە شانۆی یۆنانی‌دا دەکا . باسی یۆرپیدس‌و ئەسکیلۆس‌و شانۆگەری میدیاو شانۆگەری فارسەکان دەکات ، لە پاشان هەر خۆیشی دەڵێ « هەرچەندە ناتوانین ئەمە بەسەر کاك فهمی‌دا بسەپێنین .. ئەی ئیتر بۆچی بە خۆڕایی ئەزیەتی خۆی‌و خوێنەر دەدات‌و کاغەزو مەرەکەبیش بە خۆڕایی بەخەسار دەدات .. ئەمەیە کە پێ‌دەووترێ « نووسین لە پێناوی نووسین‌دا » ، کەچی کاك موعتەسەم خۆیشی باسی ئەدیب‌و کۆمەڵ‌و ئیلتزام ئەکات . بەدرێژایی شانۆگەری‌یەکە بابەتی ئاسایی‌و نائاسایی‌و پەیوەندی‌ی نێوان ئەم دووانە لە دەربڕیندا بەدی ناکرێ . ئەم بابەتەی ئەو باسی دەکا زۆرتر پەیوەندی‌ی بە « تغریب »ەوە هەیە لای برێشت‌و لای نووسەرانی شانۆی لامەعقول، کەچی ئەم دەیەوێ بە زۆر ئەوە بسەلمێنێ کە لای شکسپیرو فهمی کاکەیش بەدی دەکرێ .. وەڵلا من ئەمە یەك شتی وا ببیستم !!

سەیر لەوەدایە کاك موعتەسەم ئەیەوێ بڵێ لەم دونیا بەرینەدا دوو رێگا هەیە .. یا ئەوەیە سەر بە ریالیزمی سۆشیالیستی یانیش عەبەسیت .. ئەگەر ئەم نەبی ئەوی تریانیت .. جا بۆیە بێ ئەوەی موناقەشەی بیرۆکەی شانۆگەری‌یەکە بکات یەکسەر کاك فهمی دەخاتە پاڵی نووسەرانی شانۆی لامەعقولەوە ، بۆ ئەم مەبەستەش دیالۆگێکی قالە ئەکاتە بەڵگەو ئیتر ئەم حوکمە سەیرە دەدات . نازانم چۆن دەکرێ تەنیا دیالۆگێك بکرێ بە بەڵگە بۆ بیری گشتی‌ی شانۆگەری‌یەکە . جا ئەگەرهات‌و یەکێ لە پاڵەوانەکان ژیانی بەلاوە تاڵ بێ ئیتر ئەبێ نووسەرەکەشی رەش‌بین‌و ژیانی لاتاڵ‌بێ ، چونکە کاك موعتەسەم ئەڵێ : « ئەم دەنگە بەدەنگی قالە نازانم بەڵکو بە دەنگ‌و هەڵوێستی نووسەری ئەزانم » باشە بۆچی ئەم دەنگە بەدەنگی نووسەر ئەزانێ ؟ چ بەڵگەیەکی بە دەستەوەیە کە هەڵوێستی ئەم کارەکتەرە بە هەڵوێستی نووسەر دابنێ .. ئەمە ئەگەر وابێ دەبێ نووسەری شانۆگەری‌یەکەش پۆلیسی تەقاویت بێ،چونکە ئەو کارەکتەرەی ئەو باسی دەکا پۆلیسی تەقاویتە .

ئەمجا کاك موعتەسەم لە خۆڕایی‌و بێ‌ئەوەی شتێ بڵێ پەیوەندی بە شانۆگەری‌یەکەوە هەبێ باسێکی دوورو درێژی هونەرو ئەدەب‌و کۆمەڵ‌و پەیوەندی ئەمانە بەیەکترەوە دەکات . لێرەدا نامەوێ درێژە بەم زۆر بڵێ‌یی‌یە بدەم کە کاك موعتەسەم تێ‌ی‌کەوتووە .. تەنیا ئەوەیە ئیشارەت بۆ هەموو ئەو ناوە زلانە دەدەم کە ئەو باسی کردوون ، ناوەکان « پاڤیل – تۆلستۆی – دۆستویفسکی – تشیخۆف – گۆرکی – بلزاك – سیرڤانتس – هۆمیرۆس – جیمس جۆیس – ولیەم ڤۆکنەر – نیکوس کازانتزاکی – فرجینا وولف – کاسۆنا – کامۆ – فرانس کافکا » .

بە کوردی‌و بەکورتی کاك موعتەسەم شانۆگەری‌یەکەی کردووە بەدەستەکەلایەك .. نەوەڵلا بە فەرهەنگێك بۆ ناوبردنی پیاوە مەزنەکانی ئەدەب ، لەو هەموو ناوبردنانەدا وا دەرئەکەوێ کە کاك موعتەسەم رۆشنبیری‌یەکی باشی هەیە لە ئەدەبدا .. بەڵام بۆچی ئەیەوێ هەرچی‌یەکی پێ‌یە لەو باسەدا هەمووی دەربڕێ ؟!

★ ● ★

کوێخا له‌سه‌ره‌تادا په‌شۆکاو بۆ ماوه‌یه‌ك نه‌یزانی چ بلێت‌و چۆن ده‌ست‌بکا به قسه‌کردن له‌گه‌ڵیاندا .. ئه‌وه‌ی که خاوه‌نی کێلگه‌که پێی‌ووت ، له‌پڕدا له مێشکیا هه‌ڵگیرساو .. وتی :

– به‌ربه‌سته‌که دووباره رووخایه‌وه .

بۆ ماوه‌یه‌ك بێ‌ده‌نگ بوو چاوی بڕی‌یه چاوی دانیشتوان تاکو بزانێ تاکو چ راده‌یه‌ك مه‌ترسی خسته دڵیانه‌وه . به‌ڵام هیچ چاوێك دانه‌پۆشرا ، به‌ڵکو زیاتر داچه‌قاو خۆی دووریه‌وه چاوی کوێخا .. هه‌روه‌کو بڵێی خۆی به‌تاوانبار دائه‌نێن ■

کوێخا ئازایی خۆی کۆکرده‌وه‌و خۆی ئاماده کرد بۆ هاویشتنی بۆمبای دووه‌مینی : ئه‌وه‌ی ئه‌م جاره رووخاندی هه‌روه‌کو جارانی‌تر یه‌کێکه له دانیشتووانی ئه‌م دێیه .

هه‌ر که له وتنی دوا وشه‌ی بوه‌وه هه‌ستی‌کرد به ئاوێکی سارد به ناوچه‌وانی‌یه‌وه دێته خوارێ ، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که هیچ له باوه‌ڕیا نی‌یه که پیاوێك هه‌بێ له‌به‌رده‌م ( نوێنه‌ر )ی حکوومه‌ت رابوه‌ستێ ، زوو خۆی گرته‌وه‌و به‌رده‌وام‌بوو :

– به‌ڵێ .. یه‌کێك له‌ناو ئێـ .. ئێـ .. ئێما .

ئه‌یویست بڵێت له ناو ئێوه ، به‌ڵام له‌پڕ هه‌ستی کرد ئه‌و توانایه‌ی نی‌یه ، له به‌رئه‌وه وای به‌باش زانی که خۆشی تێکه‌ڵ به خه‌ڵکه‌که بکات بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر قینیان هه‌ڵنه‌گیرسێنی .

به‌ڵام هه‌روه‌کو بڵێیت ووشکانی کۆمه‌ڵێك چه‌قۆی وردو تیژبوون ، چاوی زه‌لامه‌کانی هه‌ڵدراوو ، زه‌ق‌بوون ئاگرێکی سووریان لێ‌هاته ده‌ره‌وه .

کوێخا هه‌ستی‌کرد به وشکایی‌یه‌ك له قوڕگیدا وه‌ختـه بیخنکێنێت . چاوه‌کانی وه‌کو دوو خالی کێوه ده‌ستیان کرد به جووڵانه‌وه .. به‌م لاوو به‌ولا . هه‌روه‌کو بڵێیت هه‌ستێکی راسته‌قینه‌ی به هێرشێك بێ‌گومان ئه‌یان جووڵێنێته‌وه‌و .. نایزانێت له کوێوه خه‌ریکه بۆی‌بێت . زۆر په‌شۆکاو .. خۆی پێ‌نه‌گیرا . دانیشت‌و به ده‌نگێکی نه‌رم ووتی :

– ئه‌و کرده‌وه‌یه لایق به ئێمه نی‌یه ، به‌ربه‌سته‌که بۆ چاکه‌ی هه‌موومان دامه‌زراوه .

( مام فه‌رمان ) که پیاوێکی به ته‌مه‌ن‌بوو ، ووتی :

– وانی‌یه .. ته‌نها له‌پێناوی خاوه‌نی کێلگه گه‌وره‌که دامه‌زرا ... و .. تۆش ...

خورشید له‌پڕ فه‌قیانه‌که‌ی راکێشاو به ده‌نگێکی نزم پێی‌ووت :

– کڕبه ! دوایی تۆ تاونبار ده‌کات .

له‌پڕ بێ‌ده‌نگی‌یه‌کی قورس خۆی به‌سه‌ر هه‌موویاندا زاڵ‌کرد ، ته‌نها ته‌قه ته‌قی ته‌زبێحه‌کانیان نه‌بێت که‌س‌گوێی له هیچ شتێکی تر نه‌ده‌بوو ، که له‌پاش ماوه‌یه‌کی کورت ئه‌ویش بێ‌ده‌نگی خنکاندی .

کوێخا ئه‌و بێ‌ده‌نگی‌یه‌ی ئه‌مانی به شێوه‌یێکی تایبه‌تی بۆ خۆی لێك‌دایه‌وه ، له‌و لێکدانه‌وه‌یه‌دا ئازایی‌یه‌کی تازه‌ی په‌یداکرد ووتی :

– چاوتان لێ‌یه ؟ . که واتا یه‌کێکه له‌ئێوه ..

ئه‌م جاره زۆر به روونی‌و به بێ‌هیچ ترسێك ووتی‌و به‌ده‌میا چوو :

– به‌ڵێ یه‌کێکه له ئێوه .. به‌ڵام ده‌بێ کێ بێت ؟ ده‌بێ کامتان‌بن ؟

هه‌موو تێکڕا چاویان به‌سته ناو چاوی کوێخا .. ئه‌ویش وا هه‌ستی کرد که وا دووپشك به هه‌موو گیانی‌دا ئه‌چه‌قێت :

– ئه‌رێ ئه‌وه بۆچی وه‌ها چاوتان بڕیوه‌ته ناو چاوی من ؟ بۆچی منم که به‌ربه‌سته‌که ئه‌ڕوو خێنم ؟

بێ ده‌نگی ووشه‌کانی کوشت ، کوێخا زیاتر تووڕه بوو :

– ئه‌م کرده‌وه پیسه که‌سێك نایکات .. خاین نه‌بێت .

دوا ووشه‌که‌ی وه‌ها له‌ده‌می خۆی ده‌په‌ڕاند هه‌روه‌کو بڵێیت تاوانێك له خۆی دوور ئه‌کاته‌وه .

خورشید خۆی بۆ نه‌گیرا ، لێی راپه‌ڕی ، به‌ڵام فه‌رهادی براده‌ری زوو گرتی‌و پێی ووت :

– بێ‌مێشك‌مه‌به ! ئه‌وه خه‌ریکی چیت ؟

– کوڕه چۆن ؟ ئه‌وه ئێمه به خاین دائه‌نێت . هه‌روه‌کو بڵێت ئێمه خۆمان به بێگانه فرۆشتووه.

– به‌و شێوه‌یه ئه‌یه‌وێ ئه‌وه‌ی که مه‌به‌ستێتی بیدۆزێته‌وه .

کوێخا له‌دوای ئه‌وی که گوێی له هیچ ناڕه‌زایی‌یه‌ك نه‌بوو خۆی به پاڵه‌وانێکی ته‌واو زانی ، به تانیدا چوو ، به ده‌نگێکی به‌رزتر :

– به‌ڵێ ئه‌وه خاینێکی راسته‌قینه‌یه .. زۆر زیان ئه‌گه‌یه‌نێ به هه‌موومان .. به‌ناوی دێیه پێشکه‌وتووه‌که‌شمان !! چونکه وه‌هامان ده‌رده‌خه‌ن که ئێمه تێ‌نه‌گه‌یشتوو و گه‌وجین هیچ نرخی به‌ربه‌ست‌و ئاوه‌دان کردنه‌وه نازانین .

لەپاش هەناسەکێشانێك بەردەوام بوو :

– راستە بەربەستە ئاوکۆ ئەکاتەوە بۆ کێلگە گەورەکە ، بەلام لەئەنجامدا خێرو خێراتی ئەم کێلگەیە بۆ کێیە ؟

هەر خۆی کتوپڕ وەلامی پرسیارەکەی خۆی دایەوە ، بەر لەوەی ماوەبدا بە یەکێك وەلامێکی جیاواز لەوەی لە مێشکی‌دایە بداتەوە :

– بۆ ئێمەیە .. بۆ هەموومانە .. بۆ دێیەکەمانە بۆ هەموو دانیشتووانمان‌و بۆ ئێوەیە ..

لێرەدا خورشید هەر بەیەکجاری خۆی بۆ نەگیرا :

– چ خێرو خێراتێکمان بە چنگ‌کەوت لەم کێلگەیە ؟ یان لەم بەربەستە ؟ هەموو کێلگەکانمان لەتوینییا ووشك بوون وا خەریکە بمرن . هەموو ئاوی دێیەکەمان بو کێلگەی ئەو کابرایە دەڕوا کە بەپارەیەیی زۆر عەردە هیچ‌و پوچەکەی تۆی کڕی . با بلێین عەردەکەی تۆی کڕیوە . بەلام خۆ رووبارەکەی نەکڕیوە .. رووبارەکە تاکو ئێستا هی هەموو دانیشتووانی دێیەکە بووە .. دەبێ هەر بۆ هەموو دانیشتووانی دێیەکەمان بمێنێت . کەس ناتوانێ تەنیا بۆ خۆی داگیری بکات .

کوێخا کە هیچی پێ‌نەما بلێ .. دەستی برد بۆ دوا چەکەکەی ووتی :

– کەواتا .. تۆی ئەم کردەوەیە ئەکەی .

خورشید بەر لەوەی بلێ « بلێ منم » فەرهاد بەرلەو .. هاواری کرد :

– نەء .. ئەو نی‌یە !

ئەوانی‌تر هەموو بەیەك دەنگ لەدوای فەرهاد قیژاندیان :

– نەء .. ئەو نی‌یە .. نەء ئەو نی‌یە .. نەء ئەو نی‌یە .

کوێخا بەترسەوە ووتی :

– ئەی .. ئەبێ کێ بێ ؟ کێ بێت ؟

فەرهاد دووبارە قڕاندی :

– ئێمەین هەموومان .

هەمووشیان هاواریان کرد :

– بەلێ .. ئێمەین .. هەموومان . هەموو .. هەموومان .

– کەواتا .. کەس تاوانبار مەکەن لەمەودوا ئەگەر یەکێك نزیکی بەربەستەکە بکەوێت‌و بکوژرێت .. تەنها خۆتان تاوانبار بکەن .

* * *

لە دوای چەند رۆژێك بەربەستەکە دروست‌کرایەوە .. لە جاران بەرزترو بەتین‌تر ، شەش زەلامی چەکداریش تەرخان کرا بۆ پاراستنی . بەلام هەر لەشەوی یەکەمیان .. دوانیان لێ‌کوژران .. بەبێ ئەوەی بزانرێت کێ کوشتوونی . ئەوانی تریش هیچ لەخۆیانڕا نەبینی کە لەوێ بەردەوام بن .

کوێخاو خاوەنی کێلگەکە هەر چەندیان کرد کە سی‌تریان بۆ نەدۆزرایەوە بۆ پاراستنی بەربەستەکە لە بەرئەوەی کەس نەبوو بەم ئاسانی‌یە وازی لە ژیانی خۆی هێنابێت ..

خاوەنی کێلگەکە لە بێ‌دەستەلاتی خۆی بە کوێخای ووت

– باشە..چار نی‌یە ، با دوو رۆژ لە حەفتەیەکدا ئاوەکە بۆ ئەوان بێت .

مام فەرمان ووتی :

– بەپێچەوانەوە . با دوو رۆژەکە بۆ ئەو بێت .

کوێخا بە پاڕانەوە ووتی :

– کێلگەی ئەو گەورەیە .. عەردێکی زۆرە .. دوو رۆژ بەشی ناکات .

فەرهاد ووتی :

– کەواتا .. با نیوەی .. یا سێ‌بەشی بەسەر بێ‌کێلگەو بێ عەردەکاندا دابەش بکات .

خاوەنی کێلگەکە کە گوێی لەوە بوو هیچ‌مێشکی لەسەردانەما .

– ئەم بۆگەنانە هیچ جێی بەزەیی نین .. دەبێ هەموویان بخنکێنم .. لە نوێنەدا .. خۆیان‌و ولاغیان‌و .. درختەکانیان ..

* * *

کە دانیشتووانی دێیەکە ئەوەیان بیست‌و زانییان نیازی وایە یارمەتی‌ی حکومەت وەرگرێت بۆ بەدی‌هێنانی ئەوەی کە لە مێشکدایە .. هاتن بۆ لای خورشیدو فەرهادو پێیان ووتن :

– ئەم جارە تەنها هەر دووکتان نایڕووخێنن .. دەبێ هەموومان بەیەك دەست بیڕووخێنین .

* * *

**هەر ئەو شەوە بەربەستەکە بەیەک‌جاری رووخاو ئاوەکەی بلاوبووەوە .. بەناوگشت کێلگەکاندا .. گشت کێلگەکان ..**

بلاوکردبێتەوە ئەوە خۆ ئیتر نەلەکۆڵ دەبێتەوە و نەلەکۆلی دەبنەوە زوو زوو پێی دەڵێن :

**( ئەرێ دەنگت نییە ؟ بۆ بلاو ناکەیتەوە ) .**

بەستەزمانە رەنگە هەست بە ئیحراج بکات و بەتەوازوعەوە بڵێ :

**(( ـ جارێ خەریکی خوێندنەوەم )) .**

یەکسەر لێی دەپرسن ..

**(( ـ چی دەخوێنیتەوە ؟ )) .**

بەدرۆ یاراست ناوی کتێبێك دەڵێ ،

ئەمانیش نایەڵن قسەکەی تەواو بکات و دەڵێن :

**( ـ کتێبێکی زۆر چاکە منیش دوێنێ شەو سەعات ٥ر١ تەواوم کرد .. فیعلا کتێبێکی زۆر چاکە بەلام هەندێ شـتی تیایە !! ئەویش !!! ئێ !!!**

**بەلام پیاو هەر بخوێنێتەوە .. ئەرێ بەراست زاکرەم تەواو نیە ناوی موئەلفەکەی چاکە زۆر شتی‌تری هەیە ... )) .**

ئیتر موحازەرەیێکی . . . . . . . لەسەر خوێندنەوە + جنێوی سەیر سەیر بۆ خەلکێ کە ئەم میوانـە رقی لێیانـە .. وەرە هەموو رۆژێ شەش سەعات بەسـەر بەرەو تەحەمول بکـە ، ئەمانـە :

نەرقیان لەکەسـە و نەکەسیشیان خۆش دەوێ !

پێکەنینو گریانیان جیا ناکرێتەوە !

شتێ نیە بەلایانەوە ناوی درۆ یا راسـتی بێت !

بەگومانن لەوەی مرۆڤن یان ئاژەڵ !

رەنگە نەزانن تاڵ چی‌یەو شیرین چی‌یە !

ئیتر بەم شـێوەیە شـەش رۆژی هـەفتە شەش سەعاتی رۆژێ بەسەر دەبەی !!

نازانم گوناهم چی‌یە ، ئەم شـتانەیان کردووەتە خۆراك هـەموو رۆژێ دەبێ بەگوێکرتن هەلیمژم ، مێشکم پردەکەن و دەیهارن ..

١٠ دە رۆژ ئیجازەی نەخۆشیم وەرگرتبوو ... دەبێ بچمەوە بۆ خانەقین ، نەك لەبەر ئەوەی بیری دایكو باوكو براکانم دەکـەم ، ئـەوانیش بەقەد ئەوەی بیر لـە ئەمـنم دەکەنەوە بیر لەمن ناکەنەوە ... مەبەستیشم تەنها دوور کەوتنەوەیە لەرۆتینو میـکانیکیەتی دائیرە ... گەیشـتمە خانەقین لەگەراجەوە هەتا ماڵ وەکو فلیمی سینەما یادگاری منالیم و قوتابخانەو گەرەك بەبەر چاومـا تێپەری .... هـەر کـە ئێوارە داهات هەموو گلۆپەکانی شار کوژانەوە ، کۆلانەکان تاریك بوو ، ماڵە هاوسێ‌کانمان جولە جولیان تێ‌کەوت هـەر چەن دەقیقە و منالێکی هاوسێ دەهاتە مالـەوە و بەدایکمی دەوت :

**( ـ دایکی فلان : دایـکم ئـەلێ ، چـرا ، فانوس ، مومی زیادەتان نیە ؟؟ ) .**

دایکم هـەر وەکو ئەوەی فرسـەتێکی چاکی دەست‌کەوتبێ رقو تورەیی‌و حەسـودی خۆی دەربخات ...

**( ـ نیمانە ... لەکوێ‌مان بوو ..... ) .**

کە منالەکان بە نائومێدیەوە دەچونە دەرێ دایکم زیاتر دەنگ بەرز دەکاتەوە و دەلێ :

**( ـ هەتا بۆ شقارتەیش دەنێرنە مالانەوە .. دارزین داوەشێن هەر خەریکی سەیارە و خانوو و قەنەفەو ناومال کرینن .. چەنێ رەزیلن ... هەر بەدوای موهەندیس و دکتۆر و قونتەراتچی بگەرێن و دەلالی بـۆ کچەکانتان بکەن .... چرا فانوس ، مۆم ، مۆم تەرەمـاشـتان نیە ... قوزەلقورتمان هەیە .. ) .**

لە مالیشـەوە دایکم لێ بووەتە مدیری ئیدارە ... ئەگەر چی هیچ کـاتێ لەرووی ئـەم قسانەی دایکما بێ‌دەنگ نەوەسـتاوم و زۆربەی شەرِ و هەراکانمان هەر لەسەر ئەم شتانە بووە ، کەچی ئەم ئێوارەیە وەکو ئەوەی گلۆپەکانی شاری سەری منیش فیوزیان کردبێ و پێویسـتیم بـە دایکم هەبێ شـقارتە مۆم ، یا چرایێکم بداتێ ، دەنگم نەکرد ـ باشـە هەزار جار هـەر دەنگم کردووە کەچی زیاتر جنێوی دەدا وهـار دەبوو و قسەی ساردیشی بەمن دەووت ... ئێستا گەر داوای چرای لێ‌بکەم بەفرسەتی دەزانێ و دەلێ :

**(( ـ زەهری مار ، قوزەلقورت ، کچی عالەم لەناز و نیعمەتا . دەژین ، مالیـان منالیـان ، سەیارە و مێرد وەزیفەیان ، جێو شـوێنییان و و .. و مو وو تۆیش لەباتی هەموو ئەمانـە ، چرات دەوێ تابنووسی ....**

**چی دەنووسی ؟ بۆ دەنووسی ؟ تاکەی دەنووسی ؟ » .**

دایکم ئەوەندە تانەی لێداوم وای لێ کردووم بگەمە قەناعەت و نووسین بێ سوود بزانم و ئەم پرسیارە چەند جارێ لەخۆم بکەم :

**( بۆ دەنووسم ؟ جاکێ پێویستی بەنووسینی من هەیە ؟ جانووسین چی دەکات ؟ گەرنەنووسم چاکتر نیە ؟ هەر هیچ نەبێ ئاگام لەچاوەکانی خۆم دەبێ ؟ تانەم لێ نادەن ؟ نالێن نووسینەکانی دانپیانانە ... و . و. و. و.**

بۆ بنووسم و بەمە مەزەی شەوقی نادی ئەوانەی ناوی ئەدیبیان بەخۆیانەوە ناوە وەکو بنیشت دەمجوون و لە دڵیشم نایەت ئازارە پیرۆزەکانم ببێتە بنێشت و فرێ بدرێتە تەپڵەی جگەرەی نادیەکانەوە.. ئا وەکو بنێشت دەمجوون و لێم بوونەتە پۆلیس و ڕەقیب و هەناسەکانم دەژمێرن ووشە بە ووشەی نووسینەکانم بەپێی اسقاطاتی خۆیان تەفسیر دەکەن و دەچنەلای دایکم و باوکم و خۆشکەکەم و پێیان دەڵێن کچەکەتان فلانەشت وشت وشت و و و و وتووە ... لێ یەعنی کچەکەتان .... ئاگاتان لێی بێ !

بەهەر حاڵ نازانم بۆ دەنوسم ، ئەزانم بە بێ نوسین ناژێم .. ) .

**بەهەر جۆر بوو نەموێرا داوای چرا بکەم و بچمە ژوورەکەی سەرەوە دانیشم .. ناچار بووم لەنزیکی چرای هۆڵەکەدا لەناو منالەکاندا دانیشتم ، شەرە شەق و هەوارو هوریاکانیان تێکەڵ بەمرەکەبی قەڵەمەکەم بوو ، منیش بە دیار جگەرەکەم و چراکەوە دانیشتم .. و ....**

**دایکم ووتی :**

**— هەڵسە بەسە کەی ئێستا کات و شوێنی نووسینە ..**

**« کاتی نووسین چ پرسیارێکی سەیرە .. بۆ دایکم خۆی دەزانێ چ کاتێ منالی دەبێ ، شەو ڕۆژ ، ئێوارە ، بەیانی هاوین زستان بەهار ... هاسەیرە .. کاتی‌نووسین ؟ شوێنی نووسین ؟؟ ئاسمان ، دەریا ، ئاوەدەستخانە ، گۆڕ ، کێ دەڵێ ئەمانە شوێنی نوسین نیە .. ) .**

دایکم تورە دەبێ و دەنگ بەرز دەکاتەوە

— بەری نەدایت .. تایەکی گەرم لەلەشتەوە دەبارێت ، هەڵسە بەهەندێ ئاوی سارد دەموچاوت بشۆ ...

— . . . . . .

( کەچوومە سەر کانیاوێکی سارد ویستم وشەکانم بشۆمەوە ، کەچی ووشەکانم ڕازی نەدەبوون ڕەنگ بگۆڕن و کاڵ ببنەوە ... دەیانویست بەچڵك وڕەنگی خۆیانەوە بمێنن و ئیمانیان بەڕتوش و ماکیاج نیە ... وەکو نایانەوێ ڕەنگیان بگۆڕن نایانەوێ تامیشیان بگۆڕن قەد ووشەی ژەهر تامی هەنگوین ناگرێتە خۆیەوە دەم و چاویشم بشۆم هیچ ناگۆڕێت...).

**— کچی هەڵسە لەشت زۆر گەرمە .. بەم شەوە بۆ وات بەسەر هاتووە ..**

— . . . . . .

( کە ووشەکان لەژێر سێبەری دەستما ڕادەکەن ، منیش دەبمە ڕاوچێیەکی ناشارەزا ، تا هیلاك دەبم بەدوایاندا ڕادەکەم کەچی .... ! کەی بیرکردنەوەم دەبێتە نێچیری ژێردەستم ؟؟

**— برسیت نیە .... نانت بۆگەرم بکەمەوە ؟**

— . . . . . .

( ووشە نانی منە .. کەچی جار جارێکیش مەلێۆن ووشە نابێتە پارچە نانێك بیدەمە کەساسێکی چارە ڕەش .. نانە تەنها خۆم تێر دەکات ! ) .

**— نانەکەت بخۆ ؟**

— . . . . . . .

( ئا ئێستا هەڵدەستم ووشەکانم دەشێلم و فرمێسکەکانم دەکەمە خوێ و لە ئاگردانی دەروونمدا دەیبرژێنم و لەبازاری ، کەساسەکلندا بە خۆڕای دەیفرۆشم ) .

**— نانەکەت سارد بوومەوە .**

— . . . . . . . .

( ئەوا نانی ووشەکانم بلێسەیان لێ هەڵدەستێ ، بیرەکانم ئاگریان گرتووە ... با ووشەکانم بگرمە دەستەوە بە هەناسەی ساردی سارد یان بکەمەوە و بیان مەیێنم .. ) .

« بشم کوژی نایبەیت ، بۆ تۆم بەخێو نەکردووە ، ئەی تائێستا لە کــوێ بووی ؟ بۆ نەدەهــاتی پرسیارێکی بکەی ؟! » بە سـەر سەرتەوە دەوەستێ دەستی درێژ دەکا ، چەند جارێ بــە هــەموو هێزیەوە ڕاتدەکێشێ . دەیــەوێ هەر چۆنی ێ لەژێر دەســـتت دەربێنێو تێی دەتەقێنێ. بەڵام تۆ زیـاـتر گۆڤەند بــەخـۆتــەوە دەنوسێنی .

« بـــەرمەدە، نایبەیت ، کوڕی کوڕی خۆمەو تۆ هیچ مافێکت بە سەریەوە نی‌یە » . دەکەیتـــە هاوار هاوار ، دەنگی گریانت بە ناو ژوورەکەدا بڵاو دەبێتــەوە و هەمـــــوو ئەوانەی خەوتوون وە ئاگادێنی . دایکت بە توڕەیی‌یەوە هەڵدەستێتەوە ، دێتە لات .

**ـ چیتــــە ، بۆ وا هـاواری دەکەی ! خۆ شێت نەبووی !!؟ .**

دەمت تێك دەئاڵێ ، قســەت بۆ ناکرێ . وەکو شێت لــەبــەر خۆتەوە دەکەویتە وڕێنە کردن ، بەدەوروو بەری خۆتدا دەڕوانی ، چـــاو بــە کون‌و قوژبنی نـــاو ژوورەکەدا دەگێڕی ، هیچ شتێ بــەدی نــاکــەی ســـــەرت سوڕدەمێنێ .

« ... ئەوبوو ، بەو چاوانەی خـــۆم بینم ، خەنجەرێکی بـــە دەستەوە بوو ، ئەی ئەگەر ئــەو نەبێ . کێ بوو ڕایدەکێشـــام ؟! خۆ خەوت نەبوو ! گوایە خەونم بینیووە ! من نــە خەوتووم‌و نــە خـــەونیش دەبینم » . دایکت بەجێت دێڵێ، دەچێتەوە شوێنی خۆی ، تۆش هەست ڕادەگری ، دەڵێی ئەوەك خۆی لەپشــــت دەرگاوە شاردبێتەوە هیچ نابیی ، هەڵدەستی‌یەوە . بــە ترسەوە ، ژوورەکە دەپشکنی هیچ نابینی ، بـــەرەو دەرگـــاکـــە دەچی ، دەیکەیتەوە .. « لە پشـــــت دەرگاش نی‌یە » . نەختێ ئارامت دەبێتەوە ، هەناسەیێکی قـــوڵ هەڵدەکێشی . ئەوســــا هەنگاو بەرەو حەشـــــەکە دەنێی پاش ئەوەی گڵۆپەکەی دادەگیرسێنی ، لەویش بەهەمان شـــێوە چـاو دەگێڕی ...

ســـەر پەیژە ، ژوورەکانی‌تر ، سەربان ، هیچ نابینی . شەپۆلی ترس‌و گومـــــان لــەنــاختـــا دەنیشــــێتەوە ، بۆیە چــەنــد هەنگاوێکی‌تر بـــەرەو دەرگــای حەوشـــــەکە دەنێی ، دەگەیــە ئەوێ ...

دەرگای حەوشـــــــەکەش دەکەیتــەوە ، کۆڵانێکی تاریك ، شەوێکی ترســـناك لەبەر چاوت قیت دەبێتەوە . هەرزوو دەرگاکە دادەخەیتەوە بۆ ئەوەی زیاتریش دڵنیــا بیت ، کلیلی دەرگاکە لــە باخەڵت دەردێنی ، دەیخەیتە ناو کونی کیلۆنەکەوە ، چەنــد جارێ بای‌دەدەی ، دەرگاکە کلۆم دەدەی.

**« جوانم داخســـــتووە ... پشیلەش ناتوانێ بێتە ژوورێ »**.

دێیەوە ژووری ، بەڵام گڵۆپی حەوشەکە ناکوژێنیتەوە . پشت بـــە قـــەرەوێلەکـــەی گۆڤـــەنـــد دەدەیت ، پاش کەمێ هەســــت دەکەی شتێ لەدواوە لە لەشــت دەچەقێ ، ئاورێ دەدەیتەوە .

« هیچ نی‌یە » . هێندەی پێ ناچێ هەمان شــــت دووبارە دەبێتەوە . تا هەموو گیـــانت دەکەوێتە ژان ، دەست دەکەیتە ئای ئای . بەڵام هەر چۆنی بێت دان بــە خۆتدا دەگری‌و ناهێڵی دەنگت ببێتە هۆی بیداربوونەوەی گۆڤـەنـد ، چـاوت دەخـەیتـە سەریەك . بێ ســوودە هێندەی ئاسمان خەوت لێ‌دوورە . لـــە خـۆت دەپـرسی : « بـۆ وام لێ هات ؟ نازانم . لە نێوان هەموو شـــەوێ تەنیا ئەمشـەو ! » . بــە بیـــرت دێتـــەوە . بێ ڕاگەیاندنەکەی دوێنی کـاری تێ کردووی . نیوەڕۆ بوو . لە دەرگا درا ، چوویت دەرگاکەت کردەوە، پۆلیسێ لەبەر چاوت قیت بۆوە. هێشتا لێت نەپرسی بوو ، ئــەو پێ‌ی گوتی :

**ـ لە ڕۆژی ١٥ی مانگ لـــە دادگا ئامادە دەبی ، ها ئــەوەش بێ ڕاگەیاندنەکەیە .**

**ـ بـۆ ؟**

**ـ نازانم ، خۆت بیخوێنەوە . هەموو شتێ تێ‌دەگەی ، لێرەش ئیمزایەکمان بۆ بکە .**

قەڵەمەکەی‌و پارچە کاغەزێکی نایـــە دەســـــت ، لێت وەرگـــرت ئیمزایـــەکت .. بۆ کردو قەڵەمەکـەت دایەوە . بەرەو ژوورەوە هەڵکشـــــای ، بەدەم هەنگاونا پارچە کاغەزەکەت خوێندەوە . هەموو شـــــتێ تێ‌گەیشتی ، شکاڵی لێ‌کردووی . گوایە کوڕەکە گۆڤەند ، دەبێ بۆ ئەو بێ ... دنیات لە بەر چـاو تاریك داهات ، هێندەی نــەمـا ببورێیتەوە . ئیتر لەوســاوە ، گومان ، ترس لە ناختا بارگـەی لێ‌خستووەو ، لە داخا نازانی نە بکری ، نەپێ‌بکەنی ، نە هەستی ، نە دانیشی ... دەچیتە دەرێ ، دێیەوە ژوورێ گۆڤەند دەگریتــە بـاوەش ، ماچی دەکـــــەی ، هەڵیـــدەمژی ، بــە خۆلـــەوە دەینوســــێنی ، دەیووێنی ... لەگەڵ قــــەکردنیشا گریان پــڕ گــەرووت دەبێ‌و تۆ بگـــری ، گۆڤەند [illegible] دواتەوە « چی‌یە دایــە بۆ دەگری » . کە ئەمە دەبیـــی [illegible] بی ئەم جیهـــانە [illegible] خۆیان لـــە دڵت

دەبەســــتن ناتەوێ بـەم جۆرە بیبینی . بۆیـــە کز دەبێتەوە ، نازانی ڕوو لە کوێ کەی ئێســتا ئەگەر بچێتە لای پزیشــــــکێ لەوانەیە لە سەدا سەد ئەوت پێ دەڵێ :

**– تووشی نەخۆشـــیێکی گران هاتووی، پێویستت بە حەسانەوە هەیە ، لێدانی دڵت ئاســــایی نییە ، گەرمایی لەشت لەپلەی ئاسایی بەرزتر بۆتەوە .**

بیر لە کەســــاسی خۆت دەکەیتەوە . حەوت ساڵی ڕەبەقە لە نێو ئێش‌و خەم‌و نـاســـوڕا دەتلێیـــــەوە . دەربـــای ڕقت هەڵدەســـتێ ، ڕووخســـارت تورەیی دەبارێنێ ... ئەگـــەر ئەوت لابوایە لەوانە بوو . دەست بخـەیتـــە مـلی‌و بێ بـەزەیـی پەنجەکانتی لە گەرووی بچەقێنی بەڵام ئاخ ....

هەڵدەستی‌یەوە ، هەنگاوێ ، دووان ، قاچەکانت بـە دواتەوە نایێن دەوەستی ، لێوەکـانت دەجولێنیتەوە « دەی چیتە ؟ خۆ هێنـــدەت لەبار ماوە ، وورتـە وورتێ ، نەء بـە خوا تفیشم بۆ قوت نادرێتەوە » . بە ناچـاری بە دیوی ناوەوەت دا شـــۆڕ دەبێتەوە .

« – حەوت ســـاڵ تەمەنێکی دوورو درێـــژە . چـــۆن دەبێ بیدەمەوە ؟ هیچ نەبووەوە نابێ ، نایدەمەوە . هەموو دنیاش کـۆ بێتــەوە ... نـاتــوانن ... مەسەلە بەلای مندایە ، هەر کێ دەگـری . دەڵێ چۆن دەتوانێ . کـوڕ کـوڕی خۆتــەو ئەو هیچ مافێکی بە ســـەریەوە نییە » .
بەڵام دڵی تۆ وا ناڵێ ، دەترسێ. کابرایێکی دڵ ڕقە ... هەبوشە ... بە پارە هەموو شتێ دەکات، پارێزەر ، لەوانەیە شتی تریش .

- ٢ -

دەرگا دەکرێتــــەوە ، بـانگت دەکـــەن ، دەچیتـــە ژوورێ ، ژوورەکە هۆڵێکی گەورەیە . لـە پێشەوە سێ دادپەروەر لە سەر سێ کورسی دانیشتوون . مێزێك لە پێشیانەوە دانراوەو کتێبێك‌و چەند پەڕە کاغەزێکی لەسەر ریز کـراوە . لەدواوەش کۆمـــەڵێ خەڵك بە پەرۆشـەوە چاوەڕێی دەست پێ‌کردنی مەسەلەکەن .

چاو بە ژوورەکەدا دەگێڕی . خەڵکەکە نائاسایی دێنە بەرچاوت واهەست دەکەی هەموو دەیانەوێ دژی تۆ بوەســـتن‌و لایەنی ئەو بگرن لێیـــان وورد دەبیتەوە ، پاشان بینایت دەگوێزێتەوە سەر ڕووخســـاری دادپەروەرەکان ، لەدەم‌و چاویاندا گومان دەکەی .

**« – ئائێســـتا ، شوێنی وام نـەدیوەو دەم‌و چـاوی پرقینی واشم بەرچاو نەکەوتووە » .**

یەکێ سەری رووتاوەتەوەو لە عەبوسێ دەچێ . ئەوی تر بـــە تورەییەوە قێت دەڕوانێ . دڵت دەکەوێتە لێدان ، دەلەرزی ، ناو ژوورەکەت لێ دەبێتە زیندانێکی تەسك . بینایت تێکەڵ‌و پێکەڵ دەبێ ، ناوێری ئیتر بڕوانیتـە ، نە دادپەروەرەکان ، نە خەڵکەکە. سەر بەرز دەکەیەوە ، تەماشای پەنجەرەیێکی ناو هۆڵەکە دەکەی لەنێوان شـوشەکانەوە ، چەند دیمەنێکی سەیر خۆیانت نیشـان دەدەن .

**دیمەنی یەکەم :**

دوو پاڵەوان ســــواری دوو ئەسپ بووین‌و لە کاتی غـــار غارێنا دەکەونە ڕم وەشاندن . لە ژێرەوەش نوســــراوێك بــە دەردەکـــەوێ دەیخوێنیـــەوە . « ئەوەی ئەوی تر بکوژێ . لـەم دنیـــایـــە دەتوانێ بژی !! » .

تابلۆکە وون دەبێ .

**دیمەنی دووەم دێتە پێشەوە**

منالێکی ســاوا لە باوەشـی ئـافرەتێـکا – ئـارامی گـرتووەو ئـافرەتەکـەش بـەردەوامە لـە هەژاندنەوەی خۆی ، لەگـــەڵ هەژانەوەشا ، دەمی دەجولێتەوە. گـــۆرانی دەڵێ : « **لای لایـــە کۆرپەکـــەم لای لایە** » . دەورو بەری ئافرەتەکەش ســــەوز دەچێتەوەو سروشتی جوان بـە منالەکە پێدەکـــەنێ . ئەویش وون دەبێ .

**دیمەنی سێیەم بەدەر دەکەوێ :**

پیاوێکی ڕیش ســـپی خۆی بەسەر گۆچانێکەوە چەماندۆتەوەو بە ناو پێشـــەلانێکی چڕو پڕدا هەنگاو دەنێ ، تویشـــە بەرێکی پڕ لەنانیشی بە کۆڵەوەیـــە ... کتێبێکی بەرگ دڕاویش لـــەلای چەپی لـــە ژێر هەنگڵی ئـارامی گرتووە، ناونیشانەکەی «راستی» ئا لەو ساتەدا ، دەنگێکی بـەرز بە ناو هۆڵەکـــەدا بڵاو دەبێتەوە مەحکەمە ....

لەگـــەڵ دەنگەکـــەدا وە ئاگا دێی . چاو دەکەیتەوە ، دەبینی لە ژوورەکەی ماڵی باوکتـــای‌و ئێرەش نـــە دادگایەو نەهیچ ... بۆیە بە هێمنی خـــۆت خـــوار دەکەیەوە ، دەم دەخەیە ســـەر ڕوومەتی گوڵـــەند ... چەنـد ماچێکی پڕ ســـۆزی لێ دەکەیت ئەمەش دووبارە دەکەیتەوە .

**« – هەموو دنیاش کۆبێتەوە ، ناتوانن بۆ ماوەی خولەکێ لێمت دوور خانەوە »** .

تۆ ... گەر توانیت تیشکە خوێناوییەکەی هەتاوی خۆرنشین دابارێنیتە سەرتەوە وردە هەڵەو و گوناهە بۆرەکانتی پێ بشۆیتەوە ....

گەر توانیت ئەو هەتاوە نیوە ئاوابووە لە بیلبیلەی چاوەکانتا بەدەڤو بۆنو رەنگیەوە راگریو چاوەکانتی بۆ بکەیتە هێلانە ..... / ..... / ..... / ..... / ..... / ..... / ..... / .. ؟؟

گەر بەخۆتا هاتیتەوە ... توانیت دووبارە جێی هەنگاوەکانت بژمێریتەوە ، تووە سەوزبووەکانی بێدەنگیت بژار بکەیت / داسی سەرنجت درەوی گوڵەکانی بکات / دڵت بکەیتە جۆخین/کسپەی خەمەکانت بکەیتە وەشتو شەنی بەرهەمی رێگاکەت پێ کرد ..

ئا ... ئەوێ .. گۆرەپانی ئەم چیرۆکەیە !!

ب / کات :

هەر کاتێ لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە بوویتەوە سەعاتەکەت کۆک کردو قەیتانی پێڵاوەکانت توند بەستو لە ئاوێنەکەتدا تفێکی خەستت نوساندە نێوچووانتەوەو بە چمکی کراسەکەت سڕیتەوەو سەر لە نوێ تفێکی ترو ترو ترت کردە میدالیای جەنگی بەزینو بەسەر سنگی وێنەکەتا هەڵتواسیو جارێکیتر بەلەپی دەستت سڕیتەوە ..... هەچ کاتێکیش وێرایتەو زاتت کردو نەترسای ، بە چەقۆ یا مشاری ئێسکی بازووت یا بەراسووت ببریتەوەو لە جەستەت جیای کەیتەوە ـ بەزمانی خۆت جێی ئەو برینانەی وا داخزاوەتە نێو مۆخی ئێسقانەکانتەوە ـ بیلێسیتەوە .... ئێسقانەکەیشت بکەیتە شمشاڵ .... هەچ کاتێکیش توانیت ئەو هەناسە گەرمەو بەفیرۆ چووانەت کۆکەیتەوەو بیکەیتە فو ، پف بە شمشاڵی ئێسقانەکەتا بکەیت و ئاوازی بێ سنوری لەسەر دابنێیت (( داود )) ئاسا دەنگت هەڵبڕی ، گۆرانیت بۆ کلۆلی خۆتو کەساسانی دی ووت ..

ئا .. ئەوە.. کاتە.. کاتی ئەم چیرۆکەیە !!

٣ ـ لەم چیرۆکەدا هەموو وەرزەکان لە یەك ساتو لەیەك رۆژدا کۆبوونەتەوە چەمن وەرزێکی کۆنو داهاتویش تێکەڵی یەکدی بوونو خۆیان ئاخنیوەتە ژورەکەی رزگارەوە ... گەرماوسەرما ... رەشەباو گەردەلول و زریان ... گوڵو گەڵاو ودرك هەموو بەپێی یاساییکی گوتوپڕی لە ژورەکەی رزگاردا لەنشونمادان و دەجولێنەوە ...

٤ ـ ئەو شتانەی رزگار ـ رزگاری قارەمانی ئەم چیرۆکە ـ هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکات لە قەوارەو دۆخی راستەقینەی خۆیاندان ، تەنها جارجارێ ئەو یاسا سروشتییەی تفاقەکانی خستووەتە ژێر رکێفییەوە لە ئاستێکدا دەمەبێو تفاقەکان لە سنوری قەوارەو رەنگو بۆن مەرەخەس دەبن ... بۆیە گەلێ جار لەبێ رزگار چیاییکی تیادا ئۆقرە دەگرێو گەلێ جاریش جگەرەیێك لە نێوانی پەنجەکانی دەستیا جێی نابێتەوە ... و ... !!

٥ ـ ئەومزەلێو چالاکی بووە بە ئەندام و لە لەشی رزگاردا جێگیربووە دەتوانرێ وەکو لوت / چاو / دەم / برۆ / دگان / گوێ / ئەوانیش دەستنیشان بکرێن ..

●

رزگار لە قوتابخانە گەڕایەوە بۆ ماڵ پێش ئەوەی هەموو وانەکانی تەواو بکات ... لە سەرەتای دەستپێکردنی وانەی نیگارکێشاندا مامۆستاکەی بەشەقا زللەیێك دەری کردبووە دەرێ .. بە توڕەییەوە قوتابخانەی جێهێشت ، دایکی ئەوەندە بۆڵەبۆڵو خوتەخوتی کرد ئەوەندە سەرزەنشتو توانجی تێگرت هەموو روداوەکانی وانەی نیگارکێشانی هێنایەوە یاد :

[ مامۆستا ووتی : رزگار هەڵسە/هەڵسام/ وەرە / چووم / بەو تەباشیرە سپییە تەختە رەشەکە سپی کەوە / ئەمیشم کرد / وێنەی هەتاو بکێشە / وتم مامۆستا : لەسەر تەختەی سپیو بەتەباشیری سپی چۆن دەبێ وێنەی هەتاو بکێشم ؟ یا تەباشیری رەشم بدەرێ تا وێنەی هەتاوەکە لەسەر تەختە سپیکراوەکەدا دەرکەوێ .... یا ... با تەختەکە بسڕمەوە تا رەنگە رەشە راستەقینەکەی دەرکەوێ .. ئەوجا وێنەی هەتاوت بۆ دەکێشم !!

مامۆستا روی لە قوتابیەکان کرد ووتی :ـ کێ هەتاوی رەشی بینیوە ؟ کەی هەتاوی رەش هەیە ؟

هەموو قوتابیەکان بێدەنگ بوون من وتم / مامۆستا من بینیومە / مامۆستا بێدەنگ

**بو ... دووبارەم کردەوە .. مامۆستا وتی کەی ؟ چۆن .. ؟ وتم :ـ**

**مامۆستا .. پار .. پێراریش .. ئەم ساڵیش ... دوێنیش .. مامۆستا ئەمڕۆو ئێستایش ... ئای ڕەنگەکەی چەن ناشیرین بو .. مامۆستا ئەوکاتەی هەورە ڕەشەکان لوڵو پێچ دەخۆنەوە بە ئاسماندا دەسوڕێنەوەو بەری هەتاو دەگرن ئەوکاتە .. ئا .. ئا .. مامۆستا ئەوکاتە چ جەنگێ دەست پێدەکات ، ئا ئەو ئاسمانە بەرینە دەبێتە گۆڕەپانی جەنگ ... هەتاو بە تیشک ، هەورە ڕەشەکانیش بە تاریکی ... بەم دوو چەکە شەڕ دەست پێدەکات ... تیشکە سپییەکەی هەتاو بۆر هەڵدەگەڕێ ... ڕەنگە ڕەشەکەی هەورەکانیش کاڵ دەبێتەوە .. مامۆستا نابینی ئاسمان بۆرە مامۆستا گوێت لە دەنگی هەراو هوریاکانیان نییە ؟ ئەو ناڵەو چەخماغەو هەورە بروسکانە نابیسیت؟؟ مامۆستا : باران کوژراوانی ئەو جەنگەن !! من لە باراندا کوژراوەکانیان دەژمێرم ، مامۆستا بریندارەکانیان دەناسم ... دەزانم کامیان سەر بە هەتاوە و کامیان سەر بە هەورە .. مامۆستا خۆت نەتووت « ساڵێ لە ساڵان لە باکوری ئەم زەمینەدا بارانێ ڕەش دایکرد » مامۆستا ئەو بارانە .. ئای مامۆستا ئەوانە هەموو کوژراوەکانی هەورە ڕەشەکان بو ، کەچی هەتاو سەرکەوتنیشی وەدەست نەهێنا ... مامۆستا ! ] ..**

کەچی مامۆستا شەقازللەیێکی پیاکێشام‌و قسەکەی لەدەمم بڕی‌و دەری کردمە دەرێ ... خۆزیا پەلەی نەدەکردو پێم دەووت‌و بۆیم دەسەلماند :

**« ژمارەی کوژراو بریندار ئەنجامی شەر دیاری ناکات » .**

خۆزیا پێم دەووت « **هیچ کامێکیان سەرکەوتن و دەست ناهێنن** » بریا مامۆستا ئەم ڕاستییەی لە دەمی‌منەوە دەبیست کە :

کوژراوو بریندارەکان تێکەڵی روبارو دەریاو ئوقیانوسەکان دەبنەوە جارێکی دی زیندوو دەبنەوە ، بەرەو گۆڕەپانی جەنگ ، بۆ ئەو ئاسمانە بەرینە دەفڕنەوە ئەمجارەشیان یا بە کوژراوی یا بە برینداری بەردەبنەوە،دیسانەوە هەر زیندوو دەبنەوە ... / ... / ... / ..!!

کەچی مامۆستا پەلەی کرد بەشەقازللەیێک دەری‌کردمەدەرێ .. من لێی دەبوورم وەلێ :•

**« نە هەتاو سپییەو نە لەسەر تەختەی سپی‌دا بە ڕەنگی سپی دەردەکەوێ ! » .**

بریا بە مامۆستام دەووت :ـ پەلکەزێڕینە میدالیاو ئافەرینی سەرسنگی جەنگاوەری ئەو



جەنگە بێ پایانەیە کە هەرگیز کۆتایی پێنایێت سەرکەوتوو ژێرکەوتوشی دەرناکەوێ ...

دایکی رزگار ئەوەندە خوتەخوتی کرد و ئەوەندەی بۆڵان تا رزگار تووڕە بو وتی : ــ لە هیچە تووڕەم دەکەی ، من دەمویست مامۆستا حاڵی بکەم کە هەورو هەتاو وەکو چاو و سەر وایە لە جەستەیێکدا دەمویست بڵێم مامۆستا هەتاو چاوە هەوریش سەرە ...

**چاو دەبینێ وێنە بینراوەکان کۆ دەکاتەوەو لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی شتە بینراوەکاندا ، هەورێ لە ئاسمانی نەبینراوی سەردا کۆدەبێتەوە بە کسپەی ژانی ئەو هەورە دا ئەبارێ ... وشە دائەبارێنێ .. وشەکانیش ئەو سەربازە کوژراوانەی جەنگی چاو و سەرە .. ئای بۆ ئەو وشانەی بە جەرگێو بە هێزێو ناکوژرێنێو لە سەردا دەمێننەوە .. تا ... تا ئەوانە گەر رۆژێ بەرکەونێو دابارن ئەوا لافاو هەڵئەستێ .. ئای بۆ گەمێیێک !!**

دایکی رزگار بەتوڕەییەوە ووتی :

**ــ جا کە وایە بۆ بێ دەنگ نابی ؟**

**ــ من بێ دەنگم تۆ لێم ناگەڕی ...**

رزگار زۆر توڕە بو ... رووی لە ژورە تایبەتیەکەی کردو دەرگاکەی توند بەستو سویچەکەی قوتدا .. پەشۆکابو وەکو ئەوەی لە وەئەنجام هێنانی کارێ دوا کەوتبێ ... رووی لە کتێبخانەکەی کرد و نامەکەی «سەربەست»ی برای دەرهێنا ــ کە پێش ئەوەی بۆ دواجار لەیەك دابڕێن بۆی نووسیبو ــ

رزگار تا ئێستاش بیر لەوە دەکاتەوە : ئەو شەوە کە سەربەستی برای ئەم نامەیەی دەنووسی بەرانبەری دانیشتبوو .

**« ــ چاکی کرد نووسی ... رەنگە ئەو سەردەمە منداڵ بوبێتم ــ رەنگە حاڵیش نەبوومایە گەر بەسەرزاری نامەکەی بۆم باس کردبایێت .. چاکی کرد ئەگینا لە بیرم دەچوومەوە .. » .**

خوێندنەوەی نامەکەی سەربەست بەلای رزگارەوە وەکو کارێکی رۆژانەی لێهاتووە خۆ بە ناچار دەبینێ ، بۆیە هەموو رۆژێ دەیخوێنێتەوە و هەر رۆژەش بەشێوەیێك لێی دەگات و بەجۆرە لێکدانەوەو بۆچونێکی دی رووی تێ دەکات ، ئەوەتا ئەمرۆش بە دەنگێکی هەندێ بەرز دەیخوێنێتەوە ..

## برام رزگار ...

ئێستا بەرانبەرم دانیشتوویت .. جارجارێکیش بەلا چاوەوە سەیرم دەکەی ، رەنگە بزانم بیر لەچی دەکەیتەوە رەنگیشە بەهەڵەدا چوبێتم .. بە هەر حاڵ ئێستا :

لە سەعات سفرەوە دەستم داوەتە قەڵەمەکەمەوە ... نیازم وایە لە سەعات ٢٤ و دەقیقەیێک کۆتایی بە زۆر شتی تایبەتی خۆم بێنم . ئێستا پلەی گەرما لە بارۆمەترەکەی ئەم ژورەدا لە ٥٢٨° دایە بەڵام لە لای من ٢٨٠°یە . هەمان ژمارەش لە ساتێکی دیدا دەکەوێتە ژێر سفرەوە ... ئای کەنابێتە هۆی پەیدابوونی وەرزێکی دی ... وەرزەکان لە دووبارە بوونەوەیاندا سواون .. دەبێ یا تاقە وەرزێ یا دەیان وەرزی دی بێتە خۆراکی ئەم مەردوومانەی ــ **کە خۆیان ئاخنیوەتە نێو شتە تایبەتیەکانەوە ــ** . رزگار دوێنێشەو هەر وەکو ئێستا بەرانبەرم دانیشتبوویت سەیرت دەکردم ، لەپڕ لەبەرچاومدا بویتە هەڵەو ئەمای بێهودە بە دواتا دەگەڕام ، بەرچاوم لێڵبو ، لە جێگەکەی ئێستامدا دەستەوئەژنۆ دانیشتم ، چاوم بڕیبە جێبەکەت تا ماوەیێك نەمدەتروکاند ، لەپڕ هێدیهێدی پەڵە هەڵمێکی سەوز لەسەر جێیەکەی تۆدا گرژ بووەوە ، قەوارەی تۆی وەرگرتو بوویتەوە بە ئینسان ... چاوەکانم هەلکلۆفی ، کەچی چۆنتم بینی بویتە هەڵم ئاوهاش بە هەمان دەستور گەڕایتەوە سەر دۆخی خۆت ... گەیشتمە قەناعەت کەسێ بانگهێشتنی روحتی کردبێو بەمیوانی چوبیتەلای !! **رزگار ....**

**چەند شەوێ لەمەوبەر ... لەکاتێکی صۆفیانەی خۆمدا ..**

**هەموو خەمبارانی چەوساوم بانگ کردە ژورەکەم .**

**هەموو ئەوانەی ناڵەو نازارەکانیان لەژێر کەلبەی ئینسانە خوێنمژەکاندا بووە بەخۆراکو برینەکانیان بووە بەمنێشت !!**

**زۆربەی ئەمانە بوونە میوانم ...**

**تۆ ئەزانی « ئەم ژورەمان بچکۆلەیە » وەکو دڵم وایە ، ئەم گەردوونە بەرینە لەکونجێکیا لەنگەری گرتووە ..**

« میوانەکانم » بەبێ دەنگییەوە سەرنجیان دەدام ...

زانییان بەتەمەنم .. یەکەم رۆژی پەیدا بوونی ئینسانەکانی ئەم زەمینەم لەبیرە ... رزگار -

لە ئاوێنەدا لەشم ساغە ، سەرم بەملمەوەیە .. بەڵام ..

ئەوان زانییان بەقەد ژمارەی برسی‌یەکانی ئەم جیهانە ..

جێی تیرو چەقۆ و شمشێر و گوللە بەلەشمەوە جێ‌گیربووە هەزاران جاریش « مەقصەلە » سەرمی لە لەشم جیاکردووەتەوە ئەمزانی میوانەکانم کەسێکیان نازانن لەو رۆژەوەی ئینسان فەرمانی ژیانی بەسەردا سەپێنراوە ، چەند ئاشوبو هەراو جەنگو جەدەلو جەنگی جیهانی رویداوە !!

دەمزانی ناتوانن یەکەیەکە جێی ئەو برینە نەبینراوانەی لەشم بژمێرن - کە رقی چەکەکانی مرۆوە - گەر بیانتوانی با ئەوا بێ سێ‌ودوو تفێکی خەستیان لە مێژووی ئینسان دەکرد !!

رزگار ....

لەپەنجەرەی ژورەکەمەوە دەمروانی‌یە دەرێ ... بەبێ‌دەنگی‌یەوە وردە وردە بەفر دەباری ، بێ‌دەنگیەکەی نێوان منو میوانەکانمی خەستتر دەکرد ... ئای رزگار تۆ نازانی لە تێکەڵ بوونی دوو بێ‌دەنگیا ، دەنگێکی نەبیستراوو بێ‌پایان رووم تێ‌دەکات .. ئای رزگار .. من .. من .. تەنها من دەزانم لەم کاتانەدا چ ئاوازێکی کۆنیم لا دروست دەبێ ...

میوانەکانم هەر بێ‌دەنگ بوون ... دەستیان دایە ئەلبۆمەکەم لاپەڕە بە لاپەڕە هەڵیان ئەدایەوە ... حەپەسان ، سەیری یەکدیان دەکرد ، تف لە دەمیاندا وشک‌بو ، زمانیان تێکئالا ، ورتەیان لەدەم نەهاتە دەرێ ... تەنها سەرنجم بەزمانێ لەگەڵیانا دەداو هەموو حالی‌بوون لێم گەیشتن سەیری وێنەکانمیان دەکرد ...

وێنەی منالی‌و هەرزەکاری‌و ئێستاو ئەو وێنانەی ١٠، ٥ سالی دی کامێرای رۆژگار بۆمی دە[illegible]ت .... وێنەکانم لەبەر چاویاندا سەما[illegible]د !!!

میوانەکانم کۆبوونەوە ریزیان بەست ، زانیم هەموو رێککەوتوونو بەبێ دەنگییەوە یەک بریاریان داوە کە بە پەلە بگەرێنەوە ، تا بە زوویی ژوانێکی دلدارەکانیان بکەن - کە زۆربەیان نەیانتوانیوە ئامادەبن - تا لەگولاوی خەمەکانم بێ‌بەشیان نەکەن ..

هەر یەکەو پر بەسیی‌یەکانی خەمی تەمەنمی هەڵمژی‌و رۆیشتن ! کەچی نازانم رزگار تۆ .. تۆ .. بۆچی هیچ بۆنێکت لێوە نەهات ... دەزانم روحی ئەزیەت‌کێشت دەزانم میوانی ژانگرتوویێک‌بو ... دەزانم کەسێک .. کەسێکی مەست .. مەستی تەنهایی‌و خەم ، ئیلهامی خود پەرستی گەمارۆی دابو .. تا خودی‌خۆی لەبیر کردبوو تواوبووەوە ، شانەکانی مێشکی بێ‌تەل ئاسا بەجۆرە مۆرسێکی تایبەتی بانگهێشتنی تۆو هاودەردەکانتی کرد بو ..... دلنیام کە لە ژورەکەیدا شتە تایبەتییەکانیتان بینی .. نازانم .. نا .. بۆ کە گەڕایتەوە هیچ بۆنێکت لێوە نەهات ؟؟ بۆ ..

رزگار ...

کاتێ میوانەکانم جێ‌یان هێشتم لەژورەکەمدا هەستی تەنهایی هەراسانی کردم ، دەرچومە دەرێ ، لەبەر هەیوانەکەدا وەستام وەک ئەستونێ نیگاری دەم‌وچاوێکی لەسەرکێشرابێ ئاوها بت ئاسا وەستام ... نەمزانی چۆن کۆنە برینێکی سەر دەستم کولایەوە .. لەژێر تریفەی مانگەشەوە خەوالووەکەدا دلۆپە خوێنێکی ئال لەسەر دەستمەوە رێی گرتەبەر لەبەرپێمدا کەوت رزگار ... ئەو شەوە لەبەر ئەو بەرهەیوانەدا چەندێ تریفەی ئەو مانگە شەکەتو خەوالووەم هەڵمژیبوو کردبوومە « فیکە » بە منگە منگەوە گۆرانی‌و لایەلایەم بۆ خەمەکانم دەوت ، دلۆپە خوێنەکەی بەرپێشم ئەوەندەی من و زیاتریش تریفەی هەڵمژی ... پەنما .. گەورەبو بەرزبوووەوە ، لەبەرپێمدا بووە تەپۆلکەیێک ، هەلگژامە سەری‌یەوە زیاتر گەورەبو ، بووە چیایێک ، گەورە ، گەورەتر بووەوە ، هەر گەورە دەبووەوە ، منیش تاوی هەنگاوەکانی خۆمدەدا ، بەپەلەبووم بگەمە ترۆپکی .. بێهودە بو ، هەر چەندە بەپەلە بووم « دلۆپە خوێنە چیاکەیش » لەمن بەپەلەتربو قەوارەی زیاد کات‌و گەورەتر بێت ...

ئای چ شەوێکی درێژ بو ! چ تەم و تاریکییێک دەوری تەنیم !

هەر چەند تاوی خۆمم دەدا ، چیا خوێنەکەش بەرزی بلندتر دەبووەوە مانگیش لە جێبەکـــەی خۆیدا نەدەبزووت ، پەڵە هەورە رەشـــــەکان تاسانووبویان ، بە ئاســـتەم لەنێو ئەو تـاریکە ئەستوروسفتەدا دەردەکەوت هەتاویش هـــەر خەوتبو / ... رزگار

ســـەرتاسەری تەمەنم لەنێو ماندوو بوونی ئەم شـــەوە درێژەو ئـەو دلۆپە چیـا خوێنەم کۆبووەوە ... ئای چ شـــەوێکی لێڵو تاڵ بو ... !

جۆرەها تارماییم بەدی دەکرد ، چەند بـە پەلە تاوی هەنگاوەکانم دەدا چیـا خوێنەکەیش چەند بە پەلەی بەرزبوونەوە بو ، ئەو شەوەش لە ئێمە زیاتر بە پەلەتر بو تەمەنی درێژ تر بکات ..

شەوە ـ کـە ـ دەیویســت ، نەبەزێ ، نەمرێ ، هەر هەوڵی تەمەن درێژی دەدا ، منیش هەڵپەم بو بگەمە ســـــەر ترۆپکی دلۆپە چیا خوێنەکـــەم دلۆپە چیا خوێنەکەیش لەبەرپێمدا بەرەو ژوردەکشـــا ، قایـل نەدەبو پێم بگاتـــە سەرلوتکەی ، جۆرەها دەنگی ناســاز لە گوێمدا دەزرنگایەوە ، زریانو رەشـــەبا هەڵیکرت ، تەپوتۆزێکی نائاســـایی دەوری تەنیم ، رەنگی دلۆپە چیا خوێنەکە گۆڕا ، پەست بووم ، ئای چ شـــەوێکی درێژو ســـامناک بو هەر کۆتایی نەدەهات !

تەمەنی شەو و قەوارەی چیا خوێنەکـــەو هەڵپەی من هاوجولەبوون ، شەو بەکات ، دلۆپە چیا خوێنەکە بەقەوارە رقەبەرایەتییان لـەگـەڵ یەکدی دەکرد ، لە زۆرانبازیدا بوون ، ئـارەقو سەکەتی منیش سوتەمەنیو کوژراو برینداری ئەو جەنگەیان بو ... چ جەنگێکی ترســـناك بو !! ئـەو دلۆپـــە چیـــا خوێنەم بووە گۆڕەپـــانی تاقیکردنەوەی تازە ترین چەکی سەدەیبیســـتەم و ... رزگار

لەپڕ ژێر پێم گەرم داهات ، بە پەلەتر زیاتر تاوی هەنگاوەکانم دەدا ئارەقی شینوەمۆرم دەردا ، دلۆپە ئارەقەکان لە لەشمەوە بەردەبونەوە لەبـەر پێمـــدا غلەوە دەبوون ، وردە جۆگـــەیـــــان دەبەست ، وردە جۆگەی ئارەقەکانم بوونە هەڵمو لەســـــەر ســـــەرمدا بووە پەڵە هەورێکی بێ رەنگوجولە .. ئای کە تینو بووم !!

پەڵە هەورە بێرەنگەکە بارانێکی رەشـــی دابارانده ســـــەرمەوە ، هەرکە دلۆپە بارانە رەشەکان لە لەشمەوە بەردەبوونەوە لەبەر پێمدا ورد گۆلیان دەبەستو دەبونە ئەسید (( تیزاب )) دلۆپە خوێنە چیاکەی دەسمی ، ژێر پێم وەکـــو بێژنگی لێهات !!

ئای ئەو مەرمەرە خوێنە سفتو ئەستورەی ژێر پێم ، چەند وازوو بە بارانێ رەش پوچ بو و لە ئاستی ئەو ئەسـیدەدا بەزیو بەرگەی نەگرت ژێر پێم درزی برد ، کەلێنێ ئەوەندەی ســـاجێ لە ژێر پێمەوە دەمی داچەقاندو ڕایکێشـــــامـە خوارێ .. هـــەزاران هەزار مەتر داچۆڕامـــە خوارەوە ! ئێســـــتایش ئەوەندەی کولێرەیێك ئاسمانم لێوە دیارەو لەنیو بەندیخـــانەی خوێنی خۆمەوە چاوەڕوانی هەڵدەمژم و ...

رزگار ...

رەنگە پێت سەیر بێ ، ئەگەر بڵێم من لەنێو ئەم زەندۆڵەی خوێنی خۆمدا ئەم نامەیەم بـۆت نووسی ، رەنگە بڵێی بەرانبەرم دانیشـــتبووی‌و دەتنووسی ، نەخێر نووسیبووم ، هـەر ئەوەندەم دەرفەت هەبوو بە روحی صوفی‌یانەوە هاتمە لاتو بەرانبەرت دانیشتم .. و

نەشبێ جارجارێ تارمایێك لـەم ژورەتدا قەدو قەوارەم بەدی بکەیت ئەگەئنا بەویت .. دڵنیابە ئەوە تەنها تارمایی منە ] .

سەربەست

١/١/٠٠٠٠ !؟

رزگار پاش خوێندنەوەی ئـەم نـامـەیـە بەپێچەوانەی هەموو رۆژانی رابـووردوی ، هیچ شـــتێکی لە خۆی نەپرسی ، بە هیچ بۆچونێکەوە هەوڵی شیکردنەوەی دێرەکـانی نەدا هــەر وەك ئەوەی یەکسـەر لە هەموو دیوەکانی گەیشتبێ .!!

نامەکەی وەلادا هەڵسایە سەرپێ نەیدەزانی چۆن تارمایی پۆل و قوتابیەکانو مامۆســـتاکەی لەبەر چاوی لابەرێ ..

" ـ مامۆســـتا .. /

وا دەزانێ هەتـاو ئـەو تـەنورە گەرمەیەو کولێرەی بەستەزمانەکانی ســـەر ئـەم زەمینە دەبرژێنێ ـ نەخێر دەبێ من بیســـەلێنم هەتاو تەنوور نییە ، سەرۆك کۆماری جەنگە ئەبەزێو نابەزێ ، بریا مامۆستا پەلەی نەدەکرد .. نا .. نـا .. دەبوایێ ئەمـــرۆ لە قوتابخانە هـــەر دەرکرابام ، گەر لەوانەی نیگارکێشاندا نەبوایـە

ئەوا لە وانەی کیمیادا ، رەنگە دارکاریش دەکرام و بە چەپلەرێزانەوە دەردەکرامەدەرێ ئەگەر مامۆستای کیمیا دەیبیست ، سەری سوڕدەما ، ئەگەر دەم وت :

**مامۆستا ..**

بەرەبەیان ... بەرەبەیانی ئەمڕۆ

دلێری برام خەوتبو ، پرخەپرخی دەهات ، دەمی کەفی دەچەڕاند جیرەی دگانەکانی موچوڕکەی بەلەشما دەهێنا ، بەست بووم وەئاگام هێنایەوە ، **چاوە گزەکانی کردەوە ، سەرنجی دام** ، بێ ئەوەی هەڵستە سەر پێوە ، هەر بەراکشانەوە دەستی بردە ژێر سەرینەکەی کێردێکی گەورەی دەرهێنا ، دەبریقایەوە ، بەبزە گەوجانەکەیەوە سەرنجی دەدا ، هەندێ ئەم دیوو ئەو دیوی پێ‌کرد ، جارێکیتر دەستی بەپێکەنین کردەوە ، چاوەکانی لەیەك نا ، **خەوی لێکەوتەوە** ....... !! ئیتر ورینەکردن لەباتی جیرەجیڕی دگانەکانی و پرخە پرخ بێدەنگی نێوانمانی هەژان ، بێزاری کردم ، ناچار کسکۆلم کرد ، بەرانبەری دانیشتم ... دەنگی ورێنەکەی بەرز بووەوە ، کاس بووم ، وڕ بووم ، دەنگەکان لە ژورەکەمدا پەنگیان خواردەوە / سەیر بو !!

**ئای چ سەیرێ بو !!**

ئەو وشانەی لە دەمییەوە دەردەپەڕین ، تەنها وشەی دەنگدار نەبوون ، قەدو قەوارەو بۆن‌و رەنگیان هەبوو ، دەجولانەوە سەیر بو ! هەر وشەیێک لە دەمییەوە دەهاتە دەرێ بۆن‌و رەنگ‌و جۆرە قەوارەیێکی نا ئاسایی پێوە دەلکا وەکو ئەوەی دەمی منالدان بێ ، ئەو شتانەی باسی دەکرد بە روح‌و جەستەوە دەهاتە دەرێ واقم وڕما کەدەیووت :

**[ مارێکی بارێك .. سور ، کلك سپی / دوپشکێکی شین کلك سەوز چز سور / لە نێو شوشە نەوتێکی بێ رەنگدا دلداری دەکەن / شەمشەمەکوێرەیێکی زلی شیررەنگی باڵەکانی کردووەتە چەترو کونی شوشەکەی پۆشیوە / جالجالۆکەیێکی پرتەقالی لەسەر باڵی شەمشەمەکوێرەکەدا تەونی رەش دەهۆنێتەوە / مێشێکی زێڕینی بریقەداری بێ زیوین تەونەکە تێك دەدات و ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ....... / ?!! ]**

هەر کە دلێر ئەم قسەیەی تەواو کرد مارێکی بارێکی کلك سپی لەدەمییەوە هاتە دەرێ، پاشان دوپشکە شینەکە ئەوجاش بە هێڵنجێ **(( ئای لەو هێڵنجە چ دەنگێکی هەبوو ))** شوشە نەوتێکی گەورە لەدەمییەوە دەرپەڕی .. مارە سورەکە بە ئەزیەت هەڵگژایە قەد شوشەکەوە و داچۆڕایە نێوەوە دوپشکەکەیش لە هەڵگژانەکەیدا دەیان جار بەقەد شوشەکەیا دەخزا ، تا خۆی کوتایە نێو شوشەکەوە ١٠ - ١٢ دڵۆپە ژەهری رەشی قەترانی لە چزەکەیەوە دادەچۆڕایە قەد شوشەکەوەو بەزوویی دەمەیی‌و پێوەی دەلکا ...

مارو دوپشکەکە لە نێو شوشەکەدا دەمیان لە نێو دەمی یەکدی نابو ، دلداریان دەکرد ، شەمشەمەکوێرەکەش دەرپەڕی‌و باڵی گرتەوە و لەسەر کونی شوشەکەدا نیشتەوەو باڵەکانی چەتر ئاسا نایە سەر کونی شوشەکە .. لە هەر کونا لوتێکی دلێرەوە جالجالۆکەیێکی پرتەقالی و مێشیکی زێڕین دەرپەڕین ، لەسەر باڵی شەمشەمەکوێرەکەدا کەوتنە جەنگ !!

ئای چ ڕژانەوەیێکی رەنگاورەنگ لە دەمی مارو دوپشکەکە دەهاتە دەرێ ، شوشەکە لەبڕ بونداپو .. چ ڕژانەوەیێك بو ! شوشەکە پڕ بو ، بالی شەمشەمەکوێرەکەی هەلپروزاند جالجالۆکەو مێشەکە بەربوونە نێو شوشەکەوە.. چ گیزەیێکیان لێوەدەهات کاتێ کە لە نێو ڕژانەوەکەدا دەتوانەوە ، وردە وردە هەمو جەستەی شەمشەمەکوێرەکەیش داچۆڕایە نێو شوشەکەوەو ئەویش توایەوە ..

دلێر لە خەو **هەڵسا پەلاماری شوشە « نەوتەکەی » دا نایە سەرییەوە جۆری لێ بڕی ئەی هاوار ، چۆن ئەو شوشەیەی دادەخرماند ،** واقم وڕما **ئیتر لە بۆلەبۆڵو قسە بەیەکاچووەکانی** دلێر نەدەگەیشتم **بە پەلە بەو بەرەبەیانە ژورەکەم** جێ‌هێشت‌و **هاتمەدەرێ رێی قوتابخانەم گرتە** بەر لەبەر دەرگایدا کسکۆلم کرد ، **گێژ بووم ،** لە دەفتەری یادنامەکەمدا رووداوەکانی ئەم بەرەبەیانەم تۆمار کرد تا لە بیرم نەچێتەوەو بۆ مامۆستای کیمیا بیخوێنمەوە ، کەچی هەر لە سەرەتای یەکەم وانەدا دەرکرامە دەرێ ...

* * *

رۆژگار لە نێو دەفتەرەکانیا دەفتەری یادنامەکەی دەرهێنا و ئەو نووسینەی لەبەرەبەیانی ئەمڕۆدا نووسیبووی جارێکیتر خوێندیەوە ،

نەیدەزانی چۆن لەنێو ئەو روداوانەی ئەمرۆدا ـ کە بە هەزار چاوەڕوانیو نهێنییەوە پێچراوەتەوە خۆی ون بکات .. بە ناچاری رووی لە کورسیو مێزەکەی کرد ، تا شتێ بنوسێ ، هەر چەندە ئەمسەرو ئەو سەری کرد جگە لە لیستەیێکی بێ ماناو پوچ هیچی بۆ نەنووسرا .. لیستەکەیش تەنها ناو و ژمارەی شتە تایبەتیەکانی خۆیەتی کە ئێستا لە نێو « **ئەم ژورە دەرگا بەستراوەدایە** » .

۲٥۰ کتێب / ۳۰۰ گۆڤار / ٥۰۰ رۆژنامە/ ٦۰۰ لاپەڕەی سپی / ۷۰۰ لاپەڕەی نووسراو / ۸۰۰ لاپەڕەی نیوە نووسراو / ..! لاپەڕەی یەکدێر نووسراو /۱۰۰۰ لاپەڕەی یەکڕستە لەسەر نووسراو / ئاوێنەیێک .. /

ئەلبۆمێ کامیرایێک / ۱٥۰ فلیمی نەشۆررانەوە / دوربینێ / مەتارەیێک / کلاشێ پەڕۆیین / جاشکەوشێ / جۆتی نەعل / خەنجەرێ / بێجامەیێ / ..... / ۱۰ بطلی بەتاڵ / یەکێ پر / چارەگی پاشماوەی شەوی رابوردوو / سێچوار جگەرە / هەندێ حەبو ددرمان / ..... / کورسیەك / مێزێ / **تۆپێکی نەخشەی جیهان / کتێبکی گەورەی دەسنوسی مێژوی هەموو جیهان** سەعاتێکی دەسی ویەکێ هی سەر دیوار / ..

رزگار بەڕقەوە ئەم لیستەیەی دڕاندو پارچە پارچەی کرد ، بە پەلە لەجێیەکەی خۆیەوە هەڵسا ، ئەمسەرو ئەو سەری ژورەکەی پێوا ، هەر کە ژمارەیێکی لێ تێك دەچوو لەسەرنەوە دەستی بە ژماردنی هەنگاوەکانی دەکردەوە ، ئەم کارە ئەوەندە ئەزیەتی پێ گەیاند ، ئەوەندە ماندوو بو ، بەرچاوی تاریك هەڵگەڕا ، دلۆپ دلۆپ ئارەقی ماندوو بوون پەرژینی برۆی رائەماڵی و لە گلێنەی چاوەکانیا ئەو وردە فرمێسکە نادیاریانەی دەشۆردەوە ، بەسەر چۆکا کەوت ، هەندێ پشوویدا ، هەناسە بڕکێیەکەی کەم بووەوە ، بەر چاوی رۆشن بووەوە ، بەنکەنك **هەڵسا بە مەبەستەوە رووی لە کتێبە دەسنوسەکەی مێژووی هەموو جیهان کرد ...**

« ئەگەر چی زیاتر لە سەدان جار لەو کتێبەدا رەسەنو نژادو سەرەتای پەیدا بوونو بڵاوبوونەوەی نەتەوەکەی خوێندبووەوە ، کەچی ئەمرۆ ئەوەندە بە وردی ئەو لاپەڕانەی دەخوێندەوە هەر وەکو ئەوەی بیەوێ تەمی ئەو گومانانەی کە سەرتاسەری تەمەنو بیرکردنەوەو رەفتاری جەڕانبو ، بیرەوێنێتەوە .. ئەوا وردە وردە لاپەڕەکان هەڵدەداتەوە و لەژێر لێوەوە دەخوێنێتەوە » .

## نژادو سەرەتای پەیدابوون :

**« زەمین پاش ئەو شەش شەو و رۆژەی ماندوو بوونی خواوەند » تەنها بێدەنگیو هێمنی ئاڵابوونە قەدیەوەو خەرمانە ئاسا گەمارۆیان دابو .. ئادەمو حەواو شەیتانیش پاشان نەوەکانیان ، زەمینیان ئاوەدان کردەوە ، ئیتر زاوزێو مردن لە بەردەوامبوندابو ، حەزو خۆشەویستی رقی دەزان ، رقیش تاوان ، تاوانیش دەبووە دایك ، بیری رەنگاورەنگی دەزان ، بیرکردنەوەش دەبووە کارگەی چەك ، چەکیش خۆی بە گیانی خاوەن بیرەکان تاقی دەکردەوە ، زەمینیش هەر ئاوەدان دەکرایەوە ، ئەو شارانەی خاپور دەکرا کەلاوەکانی دەبووە جێی بناغەی شارێکی دی ، دوا رۆژی کۆتایی هەر جەنگێك دەبووە رۆژی حەسانەوەو بیرکردنەوە لە نەخشەی جەنگێکی دی ... خواوەند تورە بو ، شەیتانیش رقی هەڵسا « هەردوو هەر جاویدن » خواوەند تورە بوونەکەی تفاوندە سەر « سیزیف »ەوە ، سزای هەمیشەییدا ، ئەویش دەبێ بەردێکی قورس ، زۆر گەورەو قورس لە بنارەوە سەرخاتە سەر ترۆپك ... شەیتان بەزەیی بە سیزیفا هاتەوە ، بارەگای خۆی گواستەوە بۆ سەر ئەو لوتکەیە ، خواوەندیش بۆ چاودێری کردنی رەفتارەکانی شەیتان ، لە ئاسمانی ئەو لوتکەیەدا تەختی خوایەتی دامەزراند ....**

**هەر لەگەڵ یەکەم تەکانی سیزیف ، دوو دلۆپە ئارەقی سپی لە نێو چووانییەوە داچۆڕا .. ئیتر هەر دلۆپە ئارەق بو لەگەڵ هەنگاوانی ماندوو بوونیا ، باران ئاسا دا ئەبارییە سەر ئەو رێیەی کە فەرمانی سزا مژینی گرتووەتە خۆی ..... خواوەندو شەیتان بۆ یەکەم جار رێککەوتن لە سەر ئەوەی « روح » بەو دلۆپە ئارەقانە ببەخشن و بیانکەنە ئینسان !! ..**

**بەم شێوەیە ، بەم سەرەتایە ، ئەم نەتەوەیە پەیدا بوو ، لەو رۆژەوە ، لەو رۆژە زۆر دێرینەوە ، هەر کە دلۆپە « ئارەقەکان » تێکەڵ بە خۆڵی رێگەکە دەبێ ، دەلەوتێتە رقی خواوەندو بەزەیی شەیتانەوە ، هەر کە بەردەکەیش لە نزیکی لوتکەوە غلدەبێتەوە باکردێن ئاسا دیانپەستێتەوە هەر کە جارێکی تر لە بنارەوە پاڵ بە بەردەکەوە دەنێ ، ئەوەندەی تر ، ئارەق لە لەشیەوە**

**دەتکێتە سەر هەمان ڕێگا ، ئیتر ئەم نەتەوەیە لە ڕۆژێکدا چەندین جار لە دایک دەبێو دەپەسێنرێتەوە ..**

**تا سیزیفو خواوەندو شەیتان بمێنن ، ئەم نەتەوەیە دەمێنێو لە دایک دەبێ ، چەندیان لێ هەڵوەرێ ئەوەندەی دیشیان سەربەرز دەکەنەوە ...**

**ئێستا ئەو چیایە بلندە ، تێر ئاوە ، چیمەنو سەوزەگیای زۆرە ئەویش سەبارەت بەوەی کە « خوێنی » دڵۆپە ئارەقەکان تێکەڵ بە خۆڵەکەی دەبن زەوی چیاکە باجی خۆی لێ وەردەگرێ ، تێری لێ هەڵئەمژێ .. پاشانیش هەتاو باجی لێ وەردەگرێ دەیکاتە هەڵم ، دەبێتە هەور ، لە ڕووی ئەمەکداری‌یەوە دایئەبارێنێتە سەر چیاکەوە ... ئیتر**

**سیزیفە ئارەق دەکات ، خواوەندو شەیتانیش پێدەکەنن ، خاکو هەتاویش هەر باجی خۆیان دەوێت ... ( بەردەکەیش ) هەر دڵۆپە ئارەقەکان دادەپلۆسێ .. ئارەقەکانیش هەرگیز ، هەرگیز ، هەرگیز سەربەرز دەکەنەوە ـ کۆدەبنەوە دەبنەگۆم .. دەریا .. ئۆقیانووس تا بۆ دواجار دەبنە هیلانەی هەتاو !! ...... / ...... / ...... / ...... / ...... / ...... / وەهر وەها .. ئاوها .. ئاوها ئاوهاش !! ] .**

ڕزگار لاپەرەیێکی سپی دەرهێناو بەکەتیرە نووسانییە ژێر دووا ووشەی ئەم لاپەرەیەو بەپەلە ئەمەی نووسی :

« زەمین بەدەوری هەتاودا دەسوڕێتەوە ، هەتاویش کۆترێکی دەستەمۆیە زۆر لە مێژە تەریک بووە ڕێ ناباتە ئەو شوێنەی کە تەمەنی زەرنەقوتەیی تیا بەسەر بردووە ... ئێستا پیربووە ناچارە خۆی هێلانەی خۆیەتی دەردی نامۆیی وتەریک بوون ئاگری تێ بەرداوە دەیەوێ بەخۆ سوتاندنیش بێ بچوك بێتەوە ... هەتاو لەسەرەتادا تاقە گەرایێکی ئەم گەردوونە بۆقە بووە ئێستا نەك تەنها « سەرەمێکوتە » نی‌یە بەڵکو بۆقێکەو بەرگی کۆتری باڵداری لەبەردایە ، هەتاو تەنوور نی‌یە بووکە شوشەیە منالانی لەشیر تۆراوی پێ ژیر دەکرێتەوە ... تەنوور نی‌یە نانی هیچ برسییەك نابرژێنێ ... » .

ڕزگار خەتێکی ڕاستو چەپی بەسەر ئەم نووسینەیدا هێنا بە فیکە فیکەوە هەڵسایە سەرپێ ، لە نێو ژوورەکەیدا دەستی بەهاتو چو کرد بە جۆرە ئاوازێکی تایبەتی دەیووت :

**ـــ نە هەتاو سپی‌یەو نە بەتەباشیری .....!**

ڕزگار بە پەلە ئەمسەرو ئەو سەری ژوورەکەی پەی دەکرد لەگەڵ هەموو هەنگاو هەڵهێنانێکیا ژوورەکەی گەورە دەبووەوە ، گەورە .. گەورەتر لەو شارەی کەچاوی تیادا پشکوتووە ، تۆپی نەخشەکەی جیهانیش لەسەر مێزەکەی‌دا کەوتە خوارێ ، ئەویش گەورە بووەوە ، ئەوەندە گەورە بووەوە وەکو چیایێکی خڕ لە ناوەندی ژوورەکەدا قوت بووەوە .. تەنها ژوورەکەو تۆپی نەخشەکەی جیهان لە قەوارەی خۆیاندا نەما بوون هەموو تفاقەکانی دی هەر لە قەوارەی خۆیاندا مابوونەوە بەلایەوە سەیر نەبوو لە یەك کاتدا هەردوو سەعاتەکە ـ ئەوەی دەستی‌و ئەوەی سەر دیوارەکە ـ وەستان ، وەکو ئەوەی هیچ گۆڕانێك نەبوبێ ئاوها ڕەفتاری لە نێو ئەو ژوورەدا دەکرد.. لەبن تۆپی نەخشەکەی جیهاندا ، هەندێ شانی دادا لەپڕ هەڵساو موسێکی دەرهێناو بەربووە دەمارەکانی لەشی ، لەپێشرا دەمارە ئەستورەکانی ددستو پێو بازوو ، پاشان سنگو پشتو ڕانەکانی ئەوجا وردە دەمارەکانی ژێر پێستو نێو گۆشت .. ئەم هەموو دەمارانەی دەرهێنا دایانی‌یە دەم‌یەکەوە بەوردە گرێ بەستییانییەوە یەك و هەڵی‌کرد و گلۆلەیێکی لێ دروست کرد ..

بەدگانەکانی دوو « بزماری » لە ژێر هەردوو تاکە قۆندەرەکانی دەرهێنا بزماری تاکی « چەپی » لەسەر شوێنێکی تۆپی نەخشەکەدا داکوتی بە چەند گرێ‌یێک سەری گلۆلە دەمارەکەی پێوە بەست ، بەدەوری تۆپەکەدا دەستی بە سوڕانەوە کرد ، هەر دوانزە سەعات جارێ سوڕێکی تەواو دەکردو پشوێکی دەدا ... لەم پشودانەیدا زۆر بە ئەزیەت وەبیری دەهاتەوە کە پێش ئەم پشودانە چی‌کردووەو بە چ کارێکەوە خەریك بووە ، هەر کە وەبیری دەهاتەوە بە پەلە هەڵدەسایە سەرپێو بەگوڕتر دەبوو ، دوانزە سوڕی تەواو کرد .. هەر لەگەڵ تەواو بوونی گلۆلە دەمارەکان دۆش داما ئەمسەری دەمارەکانی دەستی نەگەیشتە لای « بزمارەکە » لەو شوێنەدا کە مەترێ کەمتری مابو بگاتە لای ( بزمارەکە)وەستا، بزماری تاکی « ڕاستی » قوندەرەکەی داکوتی و ئەمسەری دەمارەکانی پێوە بەست لە نێوان هەردوو « بزمارەکاندا » وەستا تێ‌یان ڕاما بەم پتەوتینە سورەی ئەم تۆپە تێر پێکەنی ، هەندێ دور کەوتەوە نزیك بووەوە ، پێدەکەنی‌و پێکەنینەکەی دەنگی دەدایەوە بۆ چەن ساتێ دەنگدانەوەی پێکەنین وردە شتەکانی دەلەرانەوە..

رزگار بە وردی‌یەوە یەکەیەکە سەیری نەخشـەی ولاتەکانی سەر تۆپی نەخشـەکەی جیهانی دەکـرد وتی‌ی رادەما ناوی شـــارو پایتەختو چیـــاو روبارەکانو پێچاوپێچی هێڵی ســنورەکان بووە مایەی بێز هاتنەوەی . .

حەزی دەکرد دەمارەکانی بکاتــەوەو بەپی‌ی ئەندازەو درێژایی ســـنورەکان بە گێروگەوالی لەسەر هێڵەکاندا رایانخات ، کەچی باوەڕی بـەم بیرکردنەوەیەی نەبو و جی‌ی هێشت .. ئەوەندە ناوەکانی خوێنـــدەوە گێژ بـو ئـەم گێژ بوونەی هەستێکی پێ بەخشی کە خۆی لە ئاستێکدا ببینێ کە بە هەردوو دەست دەتوانێ ئەم تۆپە مەزنـەی ئەم « جیهانە » راژەنێ . . . .

کوتوپر بیری چـەقی‌یە سەر ئەوەی کـــە چاکتر وایە لە دیوی ناوەوە ســــەیری ولاتو شارەکان بکات ، دڵنیابو دەتوانێ بە مشـــتێ دەلاقەیێکی چاك بە قەوارەی خۆی بکاتەوە . . .

لە نێوانی هەردوو « بزمارەکەدا » بزماری تاکی چەپو تاکی راستی قۆندەرەکەی دا وەســتا وردە وردە بە چنگ هەندێ ســـــەر توێژی تۆپەکەی وەلادا بۆ ئەوەی ناوە کۆنەکانی شـــارو ولاتەکانی بۆ دەرکەوێ ئۆقرەی نەگرت بە مشـتێ نێوان هەردوو « بزمـارەکەی » قوپان بەقـــەد قەوارەی خۆی دەلاقەیێکی خستە سەرپشت بێ سێ‌و دوو خۆی ئاخنییە نێو تۆپەکەوە ملی رێی گرتەبەر . . .

**[ مردووەکانی هەموو زەوی لە دیوی ناوەوەی ئەم زەمینەدا زیندوو ببوونەوە بە هەمان قەدو بالاو رەنگەوە ، شارو شارستانیەتی دییان دروســت کردبو ، هەموو بە یەك زمان دەدوان ، ئەوەنـــدە زۆر بوون جمەیان دەهات ، دیوی ناوەوەی ئـەم تۆپە لە پڕ بوندا بوو ، لە هەموو شوێنێکی دیوی ناوەوەی ئەم تۆپە پێشـــوازی میوانی تازەیـــان دەکرد ـ کە لە دیوی دەرەوەدا گیانی ســـپاردبو و بەرەو ناوەوە دادەچۆڕا . . ] .**

رزگار لە نێو ئەم تۆپە بەرینەدا حەپەســـا وای زانی گەر بە پەلە زاوزێ‌و جەنگ لە سەرەوە رانەگیرێ ئـەوا دیوی ناوەوەی ئـەم تۆپە تەژی دەبێ . . . . وای‌زانی ئەم تۆپە وەکو هێلکەی ژێر مریشکی کڕکەوتوو بیستو یەك رۆژەی تـەواو کردبێ ، جوك دەدا و تۆکلەکەی دەشکێ ، ئـەم هەموو مەردوومانەی ناوەوە دەبنە وردە شـانەی زەرنەقوتەیێك ، زەرنەقوتەکەیش گــەورە دەبێ پەرو پۆ دەردەکات .

گەر ئەستێرەکانی دیش وەکو ئەم زەمینـــە گیان لەبەری تیادا بێت زاوزێ‌و جەنگیان لە نێوان دا بێ‌و بمرن‌و بچنە ناخ‌و دیوی ناوەوە ئەوا رۆژێ زووتر ئەو ئەستێرانەش زەوی ئاسا جوك دەدەن گیان لەبـەرەکـانی دیوی ناوەوەیان دەبنە وردە شانەی زەرنەقوتەیێك زەرنەقوتەکـانیش پەڕوپۆ دەردەکەن‌و گەورە دەبن ، ئەم بۆشـایەی نێوان زەوی‌و ئەستێرەکان قەوارەی ئەم « جانەوەرانە » پڕی دەکاتەوە .

گەر ئەم « جانەوەرانەش » زاوزێ‌و جەنگ بکەن ئەوا هەموو گـــەردون بێ بۆشـــــایی دەمێنێتەوە . . . لە کۆتایشدا ئەم « جانەوەرانە » دەبنە وردە شانەی لەشێکی گەورە . . . گەورەی تاقە کەفێ رەنگە تاقە « جانەوەرێك » بێ . . .

رزگار حەپەسابو ، دڵیشی خۆش بو ، بێ مەبەست دەسوڕایەوە نەماندوو بو نە شـــەری بینی نە خەو نـــە چەکی بینی نە خوێن نـــە ناوی بیـــت نە یاســـای بینی نە نازناو . . . هەموو مەردوومە زیندوو بووەکان بە تیشك تێر دەبوون تیشکیش لە هەموو شوێنێکدا هەبوو..زۆر بو.. رزگار هەر دەسوڕایەوە ، هەســـتی بە نامۆیی دەکرد کەسێ لەگەڵیا نەدەدوا بە نامۆیان دەزانی وای‌دەزانی لە نێوانیاندا لکێکە، لکێکی سەرەتانی نەگریس دەترسا تەشەنە بکاتو ئەوانیش بەم درمە گەناســـە بلەوتێنەوە بە پەلە رێی گەڕانەوەی گرتەبەر هاتەدەرێ ، « بزمـارەکانی » هـەڵکەند « بزمـــاری » تاکی « چـەپی » داکوتییە تـاکی « راســـتی » پێلاوەکـــەی « بزمـــاری » تاکی « راســـــتی » داکـــوتییە تـاکی « چەپی » پێلاوەکەی . . .

رووی لـــە ئاوێنەی ژورەکــە کرد ، تفێ تفێکی تر ، یەکێکی دیش بە نێو چووانی وێنەکەیدا جێ‌گیربو بە چمکی کراســـەکەی سڕییەوە ، قەیتانی قوندەرەکەی توند بەســـت دەمـــارە ئاڵۆزاوەکانی کۆکردەوە ، سەرێکی بە یەکێ لـــە دارەکانی بن‌میچی ژورەکەدا بەستو ئەم سەریشی بە دارێکی دی‌ی بن میچەکە بەست لەم کارەدابو تۆپی نەخشـــــەکەی جیهان بچوك بووەوە ، دەمارەکانی بووە جۆلانە ، ســـواری‌بو ، نوکی قوندەرەکەی نایە سەر نوکی تۆپەکە ، تەکانێکی‌دا ، کەوتە جولە ، خوی رادەژەنی ، هەرکە ئەم‌سەرو ئەو سەری دەکرد ، لەسەر جۆلانەکەدا بەنوکە پێ شەقێکی لە تۆپی نەخشــــەکە دەدا دیوارەکەش بۆی دەگەڕانەوە ، تۆپەکە شکا ، وردو خاش بوو

رزگار پێ‌کەنی ، دەمارەکانی لەبن میچەکە کردەوە لە جێ‌یەکانی خۆیاندا جێ‌گیری کردنەوە ، بـــە تەکانێ دەرگای ژوورەکەی شـــکاند دەرپەڕی‌یە دەرێ ... بینی هەتاو .. هەتاوێکی هـــەزار رەنگی لە ئاسماندا تیشـــکی رەنگاو رەنگی بۆندار دەبارێنێ .

**[ ئەم ووت هەتاو ســـپی نی‌یە و بەرەنگی سپی لەسەر تەختەی سپیکراودا ..../..../ .... / .... ؟ ] .**

* * *

**« بەشی دووەم »**

تێبینی :ـ

**رزگار ، قارەمانی ئەم چیرۆکە**

**ئەو رزگـارەی دەیناسن‌و نایناسن خۆشم وەکو ئێوە ، ئەویش دەمانناسێ‌و نامانناسێ لێرەدا لـەم بەشـــەی ئەم چیرۆکـەدا نیازخوازە بێ ناســـنامەو شـــاهێدی موختار ببێتە جەکی هەمووومان .**

* * *

رزگـــار پاش چەند رۆژێکی دی تەمـــەنی دەبێتە حەڤدە ســـاڵان ، تـا ســـاڵێ لەمەو بەر ـ وەک دەزانن ـ قوتابی بو حـــەزی زۆری بـــە وانەی ئیکارکێشان‌و کیمیاوە بو ... ئێســـتایش تا نەیبینم و لە خۆی نەپرسم نازانم چ کارەیە .. پێش چەند رۆژێ لەمـــەوبەر بیرم لـــە رزگـار دەکردەوەو هەلمبژارد تا بیکەمەوە بـە قارەمانی بەشێکی دی‌ی ئەو چیرۆکەی کە نزیکەی ســـاڵێ لەمەوبەر قارەمانی بو ....

بۆ ئەم مەبەستە بە دووی رزگاردا دەگەڕام‌و دەمپرسی .. وێڵ‌و سەرگەردان بووم ، شـــەوم بە پرس‌و ماندوو بوون دەبەستە دەم رۆژەوە .. بۆ دۆزینەوەی :

لە پێشدا کۆڵانەکانی شارانی غەریبیم پەی کـرد ، هـــەرچی نامۆو ئاوەکی‌و بێ‌نەوا هەبو ، هەرچی شارەزاو موختار و جامبـــاز هەبور ، هەرچی ســـــوالکەرو گەریدەو فیرار هەبوو هەموویانم بەسەر کردو هەواڵی رزگارم دەپرسی کەچی کەسێ نەبوو وڵامێکی ئەوتۆم بداتە دەس ، هەموو دەیانووت :

**« ئەم ناوەمان بیســـتووە ، نەمـــان بینیوە، نازانین لە کوێدایە ... ئێمەیش پەرۆشی دیدەنی ئەوین » .**

وڵامەکانیان بە جۆرە ووشـەیێک دەردەبڕی وامدەزانی دەیانەوێ ووشـەکان بە جۆرە یاخی‌بوونێ بەلەسە بن‌و بتەقنەوە پیتەکانی ببێتە تەڵەزم‌و بەر فەرهەنگە نووســـــتووەکان بکەوێ وەئاگایان بێنێتەوە ..

**« ئێمەیش ئەمان دیوە بەســـــــــووێ‌ی رزگارەوەین » .**

لەم وڵامانە هیچم وەدەســـت نەهێنا .. ئەوجا هەموو گۆڕەپان‌و باغچەو کەلاوەو کاباری‌و شانۆو هەموو ئەمسەرو و ئەو سەری شـــارم دایە دەم تەقەڵی هەنگاوی شەکەتم کە بە دەرزی زمانی ســـۆراغ‌و پرس دەمدوورییە دەم‌یەکەوە .. کەچی هەر نەبوو و هەر هەمـــان وڵامی بچڕبچڕم دەبیست .. بێ ئومید نەبووم پەنـام بردە بـەر مێشکم :ـ

**گشت ئەو ڕێگا پێچاو پێچانەیم دایە بەر زەین . بە دوی راستو چەپو ناوەڕاستو لا راست ولا چەپی هەندێ راستەڕێ‌ی شەقامەکانی مێشکمدا گەڕام ... هەناسـەبڕکێم ئارەقی ماندووبوونمی دەکردە هەلم‌و دەبووە جۆرە تەمێکی لێڵ‌و قورس‌و دەئالایە هەنگاوەکانمەوەو لەتری پێ دەمدام ، هەر چـەنـده خۆم هاندەدا کەچی تەنها دەنگدانەوەی دەنگی ووشەی رزگار تەلی شانەو ماســـۆلکە وردەکانی مێشکمی دەلەرزاندەوەو سەرەتای ئاوازی نەبوون‌و نهێنی بوونی سازدەداو دەیدا بـه بـای گوێما ، ئەم ئاوازەش دڵێ ئاسـا دەترەکی‌و چەن ووشەیێکی زۆڵی لە ڕێ‌ی دەمەوە بەرەو دنیـای پرسیاری کۆل دەردەپەڕان ....**

بە ناچاری بە دوی رزگاردا پەنام بردە بـەر کەلاوەو پەرستگا خاپور کراوەکانی دڵم ، هەرچی دەروێش‌و پەناهـــەندەو موریدی خـوانـــاس‌و گۆشـەگیری تیادابو ، هەموویانم بێـــدار کـرد پرســـیارەکانم ( نەتان بینیوە ؟ نازانن لەکوێ‌یە ؟ چی لێهـات ؟ بۆ کوێ چو ؟ ) تێـــکەڵ بە ویردو زکریان بو وڵامم وەدەست نەهێنـــا منیش وەکو ئەوان لە بازنەی بۆشایی و لە حاڵی دەروێشیدا ،

ون بوونو سۆراخم لە باتی ویردو دۆعا ئەمشانو شانی پێ دەکردم ... بێهودە بە نێو جیهانی دلما دەسوڕامەوەو ئاســـۆکانییم دەدایە دەم‌یەك ، لەگەڵ هەر هەنگاوێکیشما پرســـیارێکم دەکردە تۆو و دەمچاند ..

**پـەنـام بـردە بـەر خەون ئـــەو دەرگـــا تەلیســـماوی‌یانەی قەلاکـــانی خەونم ، خەونی داستانو ئەفسانەی یادی تاڵو شیرینم ـ دەرگای ئەو قەلایانەی کە بە چەن رستەیێکی نهێنی کلیلی قفەڵەکانی دەکرایەوە ... رستەکانم دەخوێند ، بـە جۆرە کڕنۆش بردنو نوێژی لـەبێ ئاگـایی‌و ونکردنی « کاشوێندا » هەڵم ئاسا بەکونو کـە لەبەری قەلای تەلیسماوی خەونمدا دەسوڕامەوە ... هەتا ناو کولەکەی روحی دێوە پاسەوانەکانی قەلاکان دەگەڕام ، بێهودەش بە نێو ئێسقانەکانی پاشماوەی خۆراکی دێوەکان دەســـوڕامەوە .. بەلکو رزگار بوبێ بە نێچیر لە کاتێکدا کـــــە ویستبێتی بەری کانیاوێکی پەنگاوەی شــــارێکی کلۆڵو تینو بـەرداو شـەمشـێری جـەوانمەردی لەڕوی دێوێکدا هەلکێشـــابێ و .... لەنێو ئێسقانە پاشماوەکانیشدا نەبوو ...**

**کێ دەڵێ رزگار**

**« نەپەڕیوەتە ئەو دیوی دەریاوە لە پەنـــای کۆشكو باغچەی پاشادا خۆی بۆ گوڵێکی ســـور مەلاس نەداوە و خێلی دوژمنیش گەمــــاروویان دابێ ؟ » .**

رزگارم دەست نەکەوت ، ئەمجارەیان پەنام بردە بەر شوشە بەتاڵەکانی پشـــــــتی ژوری نوتێلەکەمەوە ، یەکـەیەکە ئەمدیو و ئەو دیوم پێ کردن نەبوو .... هەڵسام بە پەلە هەنگاوەکانم تاو دا ، بەدوی رزگاردا لـە نـاو لنگی ئافرەتـــە قەیرەو نەزۆکو مەستەکاندا دەگەڕام ، بـەنێـــو سـەرکێشی گوناه و بێ‌دەنگی پەشیمانیاندا ، بەنێو خەونی ئاڵۆز وتارمایی پەستییانا ، بەنێو شـەرمو حەزو پێکەنینی زەردیانا دەگـەڕام ... لەگـــەڵ سـەرنجی تیژی منالانی ئافرەتە سوزانیەکاندا ـ کە تێ دەگـــەنو تێ ناگەن ـ بالم دەگرتەوە بەدووی رزگاردا بست بە بـــتی زەمینو ئاســـــمانم پەی دەکرد .. کەچی .....

ئیتر بە نێو لەپی سوالکەرو تفاقی قەدەغەی قاچاغچیەکانا دەگەڕام لە نێو سـەنگەرە روخاو و چۆلکراوەکاندا ... لەڕەش مەســـتی‌و رژانەوەو جنێو فرۆشی‌و وڕێنەکانی خۆمدا بۆی دەگەڕام .. نەبو ..

**« رزگار ...**

**چ شارێکی خاپور / چ ولاتێکی بێ نەخشەو ئالاو پەنـاهـەنـدەی ولاتێ / چ رۆخی روبارێکی وشك / چ بناری بورکانێکی شێت / چ لەنگەری دەریای فرمێســـك / چ ترۆپکی چیای خوێنینی رەشـــــــهەڵگەڕاو / چ بیابانێکی بێ ئاو / چ پێ‌دەشتێکی خوێ / .... / .... / .... / کام ژوری فەرهەنگ ئاسای ووشـــــە بە زنجیر نووســـراوی بەندیخانەیێك / کام ژوری تایبەتی شێتخانەیێك / گۆشەی کـام قەفەسێ / کـــام ئەشکەوتێ / قەفی گوریسی کام سێدارە ... کام حەوزی ئەسید /**

**لە ئامێزی گرتووی رزگار**

**رزگار ...**

**پەنای کام مزگەوتە ســـــــووتاوی کوێرە دێییك / کـــام تەختـــە زەوی‌یەکی قەدەغەی تەلبەندکراو / کـــام کانیاوێکی بـــە کـونکرێت پۆشـــراو / چ خۆڵەمیشی دار گوێزو هەنـــارو هەرمێ‌ی رق هەڵمژیوی دەنەمێت / کام خەلوزی جەنگەڵی بەڕو و قەزوانو مازووی سوتاو / کام خۆڵەمیشی ئێسقانی گۆڕستانی هەڵتەکاو / کـــام تاریکستانی لادێ کام سەرنجو پرسیاری برسی‌ی منالانی چادرنشینی پەناهەندە ... رزگار ... کـــام / چ / کـــام / لـــە کـــۆی /**

**چاوەڕوانیتو چاوەڕوانیش هەڵت دەمژێ**

**رزگار ؟ ..**

* * *

ئەوەندە گەڕام تا ماندوو بوۆن داچۆڕایـــە نێو مۆخی ئێسقانەکانمەوە هـــــەر ورەم بەرنەدا زیاتر ســـــور بووم کە دەبێ بەهەر جۆر بێ ئەم رزگارەی « گۆشەی جەرگم » بدۆزمەوە .. تا ..

لەنیوە شـەوێکی فێنكو بێ‌دەنگا ، لە چەقی دوو ریانێ ، لە پەنا وێـستگایێکی ماتدا ، لە پاینی گۆڕستانێ ، سێبەرەکەم لە ژێر تیشکی گلۆپـــە زەردو کزەکانی دارتەلی دووریانەکە ، ســـــەمای دەکرد ... گاە راوی دەنام وگاە وەپێشــــــم دەکـــەوت ، درێژ دەبووەوە .... مانـدوویەتیم

